ناوی پەرتوک: ژنۆلۆژی
بابەت: تێزەکانی رێبەر ئۆجەلان بۆ ئازادی ژن
ئامادەکار: ئاکادیمیای ژنۆلۆژی
تیراژ: (٥٠٠) دانە
چاپخانە: رەنج
چاپی یەکەم: ئۆکتوبەری ٢٠١٢

## ناوەرۆک

# پێشەکی

بەرلەهەموو شتێک پێناسەکردنی ژن و دەستنیشانکردنی رۆڵەکەی لەژیانی کۆمەڵگادا بۆ ژیانی راست مەرجە. بەهۆی تایبەتمەندییە بایۆلۆژی و پێگە کۆمەڵایەتیەکەی ژنەوە ئاماژە بەو داوەرییە ناکەین. وەک کەینونەو بوونێک دەستەواژەی ژن گرنگە. بەو رادەیەی ژن پێناسە بکرێت ئەگەری پێناسەکردنی پیاویش هەیە. لەمیانەی دەست پێکردن بە پیاوەوە ناتوانین پێناسەیەکی راست بۆ ژن و ژیان بکەین. بوونی سروشتی ژن لە پێگەیەکی ناوەندی تر دایە. لەبواری بایۆلۆژیشەوە دۆخەکە بەم جۆرەیە. بچووککردنەوەی ستاتۆو بێ کاریگەرکردنی ژن لەلایەن کۆمەڵگای پیاوسالارییەوە پێویستە تێگەیشتنی راستی ژنمان لێ بەربەست نەکات. سروشتی ژیان زیاتر پەیوەندی بە ژنەوە هەیە. پەراوێزخستن و بەدەرنانی ژن لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو راستیە ناگۆڕێت، بەپێچەوانەوە دەیسەلمێنێت. پیاو بەهێزە لەناوبەرو زۆردارەکەیەوە لەراستیدا لەکەسایەتی ژندا هێرش دەکاتە سەر ژیان. بەو سیفەتەی باڵادەستی کۆمەڵگایە دوژمنایەتی پیاو بۆ ژیان و وێرانکردنی لەنزیکەوە پابەندی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیەیە کەتێیدا دەژیت. کاتێک ئەو داوەریەمان دەکەین بەگەردوونی دەشێت دوالیزمی وزە - مادده بەبنەما بگرین. بەبەراورد لەگەڵ مادده وزە سەرەکیترە. خودی ماددەش وزەی بەبونیاد بووە. ماددەش شێوەی شاردنەوەی وزەو بوونەکەیەتی کە بووە بەفۆڕم. بەو تایبەتمەندێتیەوە مادده وزە دەخاتە قەفەزەوە و لێشاو و جولەکەی دەوەستێنێت. پشکی وزەی هەر فۆڕمێکی مادده لێک جیاوازە. هەڵبەتە ئەو جیاوازیەی وزەش جیاوازی نێوان فۆرم و بونیادە ماددییەکان دەست نیشان دەکات. وزەی مادده و فۆڕمی ژن لەگەڵ وزەی ماددەی پیاو جیاوازە. ئەو وزەیەی ژن هەڵیگرتووە هەم زیاترە هەم چۆنیەتی وزەکە جیاوازترە. فۆرمی ژن سەرچاوەی ئافراندنی ئەو جیاوازیەیە. کاتێک لەسروشتی کۆمەڵگا وزەی پیاو بۆ ئامێرەکانی دەسەڵات دەگۆڕێت دۆخی شێوەو فۆرمی ماددی بەدەست دێنێت. بەو سیفەتەی وزەی ساردەوە بووە شێوەکانی لەتەواوی گەردوون محافەزەکارن. بوون بە پیاوی زاڵ یان باڵادەست لەکۆمەڵگادا گەیشتنە بەدۆخی شێوەگرتنی دەسەڵات. بەو حاڵەتەشیەوە ئەو وزەیەی هەڵیگرتووە زیاتر فۆرمی بەدەستهێناوە. ئەو وزەیەی بۆ فۆرم نەگۆڕاوە کەمە و لە کەسانێکی زۆر دەگمەندا روودەدات. هەرچی لە ژندایە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا وزە نابێتە فۆرم و ناکەوێتە شێوەیەکەوە. وزە دۆخی لێشاوو بزێوی خۆی دەپارێزێت لە ژندا. ئەگەر نەخرێتە ناو فۆرم و هزری پیاو و تێیدا بەند نەکرێت ئەوا بەسیفەتی وزەی ژیان بەردەوامی بەلێشاوو بزێوی خۆی دەدات. ئەو جوانی و بەهرە شیعریی و رۆحیەی (پۆتانسێلی مانا) ژن کە نەبووە بە بەستەڵەک لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو دۆخەی وزەیە.

عەبدوڵا ئۆجەلان

## بەشی یەکەم

### ١. کۆمەڵگەی نیولۆتیک بە دەستی ژن ـ دایک لە زهن و دڵ دا بەرجەستە کرا.

بلیمەتی سەرەکی مرۆڤایەتی لەقووڵایی نیۆلیتیکدا شاراوەیە؛ لەوێ خوڵقاوە و پێشکەوتووە. دەرکەوتنە شکۆدارەکانی پێغەمبەرایەتی و دەزگابوونی دیسان هێزێکی دیکەی زایینی کولتوورە. ئەو ڕێگایەی بەرەو فەلسەفەی یۆنانی چووە، بەم ناوچەیەدا، بەشوێنپێی نەریتی زەردەشتدا تێپەڕیوە. ئەمەش سەرچاوەی خۆی لەجیاکاری مەعریفی ناوچەکە وەردەگرێت. سەرەکیترین ناوچەی لەدایکبوونی کولتووری خوداوەندی ژن و دایکە. خوداوەندە ژنی هۆری هەپتا، دواتر وەکو یەکەمین دایک لەکتێبە ئایینیە پیرۆزەکاندا بوو بە حەوا. لای هیتیتیەکان بووە بە کوپاپا، لای فریگیەکان کیبەلە، لای عەرەبەکان بووە بە قیبلە و لە مەککە ( کەعبە ) جێگیرکراوە. لەریشەی هەموویاندا کولتووری ستێرک هەیە، کە لەئاسمان لەمیانەی ئەستێرەکان نوێنەرایەتی خوداوەندی ژن، خوڵقێنەری نیۆلیتیک دەکات. لای سۆمەریەکان بوو بە ئینانا ـ عەشتار، لای میسریەکان بووە بە ئیسیس، لای یۆنانیەکان ئافرۆدیت، رۆمانیەکانیش ڤینۆس، لای مەسیحیەکان بووە بە مەریەم. تەواوی خواوەندە ژنە مەزن و ناسراوەکانی وەکو عەشتار، ئینانا، ئیسیس، دەمەترە، کیبەلە، ئیندرا پاشماوەی ئەم قۆناخەن. لەمیانەی ئەو پەیکەرانەی ژنان کە لەو سەردەمە ماونەتەوە و لە هەموو شوێنێکی نیشتەجێی نیۆلیتیک دانراون، ئەم راستییەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ژن وەکو خوداوەندێکی دەسەڵاتدار و بەربڵاو بۆتە خاوەن گرنگی و رۆڵ. ژن، هاوشێوەی خاکە بە پیتەکان و دایکە خوداوەندی زایینە (ولادە). ژن دەبێتە خاوەنی پیرۆزییەکی مەزن، ئایینی کۆنی تەوتەم دەخاتە پلەی دووەم، بیر و باوەڕی خۆی زاڵدەکات، وەکو خۆر، مانگ، ئەستێرە و بەها ئاسمانییەکان بەهای پێدەبەخشێت. لە زمانی ئاریان"ستارک" هەم بە واتای خودا، پیرۆزی مەزن، هەم بە واتای ئەستێرە دێت. بە تەنیا زاراوەی ستار بە شێوەیەکی گرنگ پێناسەی راستینەی ئایینی ئەو قۆناخە ڕووندەکاتەوە. لەبەر ئەوەی ئاژەڵی وەکو گامێش، چێل، بزن و بەراز بایەخداربوون، دەگەیەنرێنە ئاستی خوداوەندی و دیمەنەکانیان بە کاردەهێنرێت. هەر شوێنێکی خوداوەندە ژنەکانی لێبێت، ئەوانیش هەن، لەگەڵیاندا هاوبەشن. گامێشی بە ناوی ئاپیس یەکێک لە گرنگترین خوداوەندەکانی میسرە. "هۆرۆس" واتە بزن بوونەوەری پیرۆزن. تاوەکو ئێستا چێل لە هیندستان دەستی لێنادرێت.

هێزی "مانا" لە ئایینەکانی پێشوودا بەربڵاوبوو، بۆ ژمارەیەکی کەمی بوونەوەرەکان گواستراونەوە، بەڵام گرنگیەکانی لە ڕێزی پێشەوە دێت و، ئەو ژمارە زۆرەی کە لە تەوتەمەکاندا هەبوو داخراوەتە نێو خوداوەندە سنووردارەکان و، گەورەترین بوونەوەریش سەمبۆلی هێزی زایین خوداوەندی دایکە. لە ئاستی هەرێمەکاندا ناوی خوداوەندە ژنەکانیش دەردەکەوێت. تەنانەت یەک پەیکەری پیاوبوونی نییە و نابینرێت. پیاو لە باوەشی خوداوەندی ژن ـ دایک وەکو کوڕ ـ یاخود مێرد گرنگی خۆی هەیە. دووانەکانی عەشتار ـ دوموزی، ئیسیس ـ ئۆسیریس، ئافرۆدیت ـ ئادۆنیس، کیبەلە ـ ئادیسی میتۆلۆژیاکان، نوێنەرایەتی کولتووری خوداوەندی ژن ـ دایک دەکەن کە سەرچاوەکەی لە قۆناخی نیۆلیتیک دێت و بناخەی کولتووری تەواوی مرۆڤایەتی پێکدێنێت. لێرەدا گرنگترین مەسەلە کە پێویستە لێی تێبگەین، ئەوەیە کە قۆناخێک بەر لە مێژوو هەبووە کە پیرۆزی و پێشەنگایەتی ژن لە ئارادابووە و پیاویش وەکو منداڵێکی هەژار گرێدراوی ژن بووە.

هێزی دەست پێکردنی شۆڕشی کشتوکاڵی نیۆلیتیک ژنە و هێزیش لەتواناکاری زاوزێ وەردەگرێت، بۆیە تەواوی خواوەندەکان لە رووخساری ژندان. لەیەکەمین قۆناخی سۆمەرییەکان، میسریەکان و هیندیەکانیش ناوی خواوەندی لەژنان دەنرا. لایەنی پیاوێتی خواوەندی زۆر دوای ئەوە دەردەکەوێت. تەواوی ئەو پەیکەرانەی لەسەردەمی نیۆلیتیکەوە ماونەتەوە لە شێوەی ژن دروستکراون.

پەیکەری پیاوان هێندە کەمە دەتوانرێ بگووترێ نییە. خودا و مرۆڤ بەیەکەوەن. خوداوەندێکی لە مرۆڤ دابڕاو، واتە هێشتا چەمکی ئایین پێشنەکەوتووە.

شێوەگرتنی ئایینی قـۆنـاخ و چەرخ، دەبێتە گوزارشتی ئایدیۆلۆژی تیرە و یەکینە پێشکەوتووترەکانی کۆمەڵگا. بە گوێرەی ژمارەی ئەو دیاردە سەرەکیانەی رۆڵ لە ژیانی تیرەدا دەبینن خواوەند پێکدێن. تا چ رادەیەک هەست بە هێزە سەرەکیەکان بکرێت، چەندە زیان و سوودەکانیان مەزەندە بکرێت، ئەوەندە زاراوە هەیە، بە هێندە خواوەند گەیشتوون. شێوەی هزر و سیستەمی زاراوەکان هەمووی لە میانەی خواوەندەکان گوزارشتی لێدەکرێت و بەڕێوە دەبرێت. بێگومان ئەمانەش بە گوێرەی پلە و پایەی خواوەندەکان ریزبەند دەکرێن.

نابێ لەوە سەرمان سووڕبمێنێ کە هێزی سیحراوی ئەم زاراوانە بکرێن بە خواوەند. ئەو سەردەمانە سەردەمی یەکەمین لە دایکبوون و خوڵقاندنە. هەر زاراوە و تواناکاریەکی نوێ، بەواتای خودایەکی نوێ دێت. رۆڵی سەرەکی دایک لەبەرهەمهێنان و تایبەتمەندێتی زاوزێ، بایەخێکی نائاسایی پەیدا دەکات و رێگا لەپێش قۆناخی خوداوەندە ژنەکان دەکاتەوە. چونکە چەندین دۆزینەوە و داهێنان لەلایەن ژنەوە ئەنجامدراوە. شیمانەی ئەوە لەپێشە دانەوێڵەی بە سوود، دارەکانی میوە، ماڵیکردنی ئاژەڵ، بەکارهێنانی زەوی، ئاواکردنی ماڵ "خانوو"، منداڵ بە خێوکردن، کێڵان، ئاشی دەست و یەکەمین گالیسکە لە دۆزینەوە و داهێنانی ژن بووبێت. چەرخی خواوەندەکانی دایک دوای ئەم پێشکەوتنە مەزنانە دەبێتە سەمبۆلی رۆڵی ژن.

ناوەڕۆکی پلەداری پشت ئەستوور بەژن ـ دایک تاکو ئێستاش لەتەواوی کۆمەڵگاکان وەک دەسەڵات و هێزێکی مەزن پەسەند دەکرێ، ئەمەش بنەمای مێژوویی و بابەتی " دایک"ە. چونکە دایک لەناو سەختترین هەلومەرجیشدا فاکتەرێکی پێشەنگی منداڵبوون و بەخێوکردنییەتی. ئەو کولتووره پلەداری و دەسەڵاتەی لەسەر ئەم بنەمایە پێکهاتووە، هەڵبەتە پەیوەندی و پەیوەستبوونێکی مەزن بەخۆیەوە دەبینێ. ئەگەر تارۆژگاری ئەمرۆشمان بناخەی هەبوونی کۆمەڵگا پێک دێنێت، ئەمەش بەڵگەی سەلمێنەری بەهێزی چەمکی (بیرۆکە)ی دایکە. هەروەکو مەزندە دەکرێ ئەمە تەنیا بۆ تایبەتمەندێتی داتاشراوی (واتایی) بیۆلۆژی زاوزێ (منداڵبوون) ناگەڕێتەوە. پێویستە دایکەخوداوەند وەک گرنگترین بیرۆکە و دیاردەی کۆمەڵگا دەرکی پێبکرێت. تەواو بەرووی دیاردەی دەوڵەت داخراوە، سەرجەم ئەو تایبەتمەندێتیانە لەناواخنی خۆی دەگرێت کە دەوڵەت ناخولقێنن.

لەبەر ئەوەی هێزی پێشەنگی قۆناخی کشتوکاڵ و ماڵیکردنی ئاژەڵ ژن بوو، بۆیە شێوازێکی ژنان مۆری خۆی لەپێشکەوتنەکانی هزر و زمان داوە. تاوەکو ئێستا لە چەندین زماندا ئەم پاشگر و پێشگرانە بە کاردەهێنرێت. هەروەها لەبەر ئەوەی پێگەیاندنی دانەوێڵە و ماڵیکردنی ئاژەڵەکان بە گرانی گرێدراوی هزر و پراکتیکی ژن بوو، ئەمە رێگای لەپێش ئەوەدا کردەوە ببێتە خوداوەندە دایکی تەواوی ئەم بەرهەمانە.

چەمکی ئایینی خوداوەندەکانی دۆستی مرۆڤی سەردەمی نیۆلیتیک، گەوهەری سەرەکی کۆمەڵگای ئەو سەردەمە نیشاندەدات. کارەکتەری کۆمەڵگای ئارام و تەبا، بە بەراوردکردن لەگەڵ مافی دێرینی بەربەریەت توانستە بەهەشتیەکانی سوود وەرگرتن لە سروشت، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە خواوەندەکان لە ناسنامەیەک بکرێن بە سەمبۆڵ کە بەخشندەیە و دۆستە و بەمجۆرەش واتادار بێت. لەگەڵ مرۆڤەکان تێکەڵ بە یەکترن. چونکە کۆمەڵگا لەگەڵ ئەو دیاردانەدا بەناویەکداچووە کەخواوەندەکان نوێنەرایەتی دەکەن.

گرنگترین بەڵگەش ئەمەیە کە ئەو جوگرافیا و هەلومەرج و کەش و هەوای کە نیلی ئابڵۆقە داوە، لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە تەنیا بەشێوەیەکی جیا کولتووری دانەوێڵە و ئاژەڵ دەرفەت و تواناکاری بە شۆڕشی کشتوکاڵی نیۆلیتیک نادات. ئەگەر ئەمە بەدی هاتبوایە ئەوا بەهۆی ئەو هەلومەرجە نەگۆڕانەی، هەر لە زووەوە دۆڵی نیل دەبووە لانکەی شۆڕشێکی شار و کشتوکاڵ.

**کۆمەڵگای نیۆلیتیک هێندە مۆرکی ژنی پێوەیە و ژن تێیدا بە کاریگەرە، وەکو بڵێی پیاو سڕاوەتەوە. ئەمەش هەروەکو ژنانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان وایە کە وەکو هێزێکی سەرەکی کۆمەڵگا نین. ژن ئەم هێزە لە پێگەیاندنی دانەوێڵە، ماڵیکردنی ئاژەڵ، ئاواکردنی شوێنی حەوانەوە، لە چنین و هاڕین و منداڵ بوون و بەخێوکردنیدا بەدەستدێنێ. ئەمەش بەهێزبوونێکی نائاساییە.**

**دانەوێڵەی وەکو گەنم و گەنمەشامی، داری وەکو مازوو، دارمێو لە نێو ئەو بوونەوەرانەدا جێگای خۆیان دەگرن، کە خاوەنی پیرۆزییەکی خودایین و وەکو نیعمەتی سەرەکی دەبینرێن، کولتوورێکی ژن لەگەشەکردن دایە کە ناتوانرێ جڵەو بکرێ، پیرۆزیی ئەو هێزەی لەگەڵ کۆمەڵگا پێکهاتووە بەشێوەیەکی ئاشکراتر خۆی لە سیحربازیدا نیشاندەدات. سیحربازی تاقیکردنەوەی بەهێز بوونی کۆمەڵگایە. چونکە ئاستی هۆشیاری کە لەئارادایە تەنیا بە شێوەی سیحربازی پراکتیزە دەکرێت. سیحربازی دایکی زانستیشە. ژن زانا و بیریاری ئەم شێوازەی کۆمەڵگایە کە بەردەوام چاودێری سروشت دەکات، لە ڕێیەوە ژیان دەدۆزێتەوە، لەدایکبوون (زاوزێ) دەناسێ. ژمارەی زۆری سیحربازە ژنەکان گوزارشتی ئەم ڕاستییەیە.**

**لە ڕێگای تێڕوانینەکانیان دەبن بە ژنی سیحرباز و زانا. چەندە ژمارەیەکی زۆری منداڵ و پیاوی دۆست (نزیک) بەم سیستەمە ببەستێتەوە، بەو ڕادەیە ژن ـ دایکێکی بەهێزە وەک پێویستییەکی ژیانی کرداری ژن زۆر بەباشی ئاگاداری ئەو ڕووداوانەیە کەلەناو کۆمەڵگای سروشتیدا ڕوودەدەن. لەتەواوی ئەو پەیکەر و ئامرازانەی لەم قۆناخەدا بۆمان ماوەتەوە شۆێنپەنجەی ژن دەبینرێ. قڵان (تیرەی بەرایی)یەکێتیەکە لەچواردەوری ژن ـ دایک پێکهاتووە. منداڵبوون و بەخێوکردنی ناچاری ڕەوشی باشترین کۆکەرەوەی بەرهەم و دایانێتی دەکات. منداڵ تەنیا دایک دەناسێ. هێشتا پیاو هیچ کاریگەرییەکی لەجۆری موڵکایەتی لەسەر ژن نییە. هەروەکو چۆن نەدەزانرا ژن لەکامە پیاو بووە بە دووگیان، بەڵام دەزانرا کە منداڵەکان لەکامە ژنن. ئەم ناچارییە سروشتییە هێزێکی کۆمەڵگای پشت ئەستوور بە ژن فەراهەم دەکات. لەخۆوەگرتنی کارەکتەری مێیینەیی زۆربەی بابەتەکانی لەم قۆناخە بەناو کراون، بەڵگەیەکی دیکەی ئەم ڕاستییەیە. جەنگاوەری و کاریگەری زاڵبوونی پیاویش کە زۆر دواتر پێشدەکەوێت، لەتایبەتمەندێتی ڕاوکردنی ئاژەڵە بەهێزەکانی ئەم قۆناخە سەرچاوە دەگرێت. تایبەتمەندێتییە جەستەییەکان (فسیۆلۆژییەکان)ی پیاو زیاتر ناچاری ئەوەی دەکات لەشوێنە دوورەکان بەدوای نێچیر دا بگەڕێت، تیرە لە هەڕەشەو مەترسییەکان بپارێزێت. ئەم ڕۆڵانەی کە پێگەی دیاریکراو و یەکلایکەرەوەی نەبوو، ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە بۆچی پیاو بەداخوراوی ماوەتەوەو بێکاریگەربووە، پەیوەندی تایبەت لەناو تیرەپێشنەکەوتووە، ئەوەی لەڕێگەی کۆکردنەوەو ڕاوکردن دەستدەکەوێت هی هەمووانە. منداڵەکان موڵکی سەرجەم تیرەیە. نە پیاو نەژن هێشتا نەکراوە بەموڵکی تایبەت.**

**فۆرم و بچمی (قڵان) تیرەی سەرەتایی: زەمینەی لەدایکبوونی کۆمەڵگا و یەکەمین زاکیرە و پێشکەوتنی بابەتە سەرەکیەکانی هۆشیاری و باوەڕی یە. ئەوەی وەک ئاسەوار لەدوای ماوەتەوە ئەو ڕاستیەیە کەکۆمەڵگایەکی تەندروست و تۆکمە دەبێ بەژینگەی سروشتی و هێزی ژن پشت ئەستوور بێ، شێوازی بوون ودەرکەوتنی مرۆڤ لەمیانەی هاوکاریەکی بەهێزی بێ فشارو چەوسانەوە بەدیهات. لەواتایەکدا مرۆڤایەتی ئاوێتە و پێکهاتەی ئەم بەها بنچینەییانەیە، مەزەندەکردنی لەناوچوون و ونبوونی ئەم ئەزموونە کۆمەڵایەتییە ملیۆنان ساڵی خایاندووە بەهەڵەداچوون و ناماقوڵیەوە. هەروەکو چۆن هیچ شتێ لەسروشت لەناو ناچێت، ئەم مەیلە زیاتر بەشێوازی بوونی کۆمەڵایەتی بەردەوامی بەهەبوونی هێزی خۆی دەدات.**

**ئازادی تیرە هەستێکی زۆر بەهێزە. پەرستگای ئەو ئایینانە پێشدەخرێت کە مۆرکی خوداوەندی ژنی پێوەیە. لەم قۆناخەدا لەهەموو شوێنەکانی نیشتەجێ بووندا پەیکەری بچووکی خوداوەندە ژنە سەرەکییەکان لەزۆر شوێن دانراوە و هەیە. ژن لەمیانەی ئەستێرە و مانگەوە نوێنەرایەتی دەکرێت، بەڵام زیاتر خاوەن گرانییەکی بەمجۆرەیە کە بەدایکی سروشتی هێزە سروشتییەکان دادەنرێت. تێگەیشتنی ئەمە زەحمەت نییە. لەمیانەی ڕەنجی خوڵقاندنی کشتوکاڵ و ماڵیکردنی ئاژەڵ، هەروەها وەکو دایکی ئەو منداڵانەی دەیانهێنێتە دونیاوە، لەمێژوودا بەگەورەترین شێوە پیرۆز دەکرێت. لەواتایەکدا هێزی خوڵقێنەری ژیانە. سروشت و خاک دایکە. ئەو هێزەی سروشت و بەروو بوومی دانەوێڵە و دارەکانی دۆزیەوە، دەبێتە نوێنەری خوداوەندە ژنەکان و وەکو**

کارەکتەرێکی سروشتی، واتابەخش دەبێت. گرنگی ژن ـ دایک کە بە شێوەیەکی نائاسایی زیاد دەکات، بەرامبەر بەپیاو رێگا لەپێش بالاًبوونێکی زەق و بەرچاو دەکاتەوە.

یەکەمین نموونەی سەرەتایی سیاسەتیش لەم شێوەیەی کۆمەڵگادا دەبینین. ئەو کۆمەڵگایەی تا ئاستی چەند تیرەیەک مەزن بووە، رووبەڕووی کێشەی بەڕێوەبەرایەتی دەمێنێتەوە. کەسانی هەرە بەئەزموون لەناو تیرە و ئەوانەی درێژە بە پێشکەوتن دەدەن بەشێوەیەکی سروشتی رۆڵی رێبەرایەتی دەبینن، لەسەر ئەم بنەمایەش بەشێوەی شامان و سیحربازی دابەش دەبن. رێبەرایەتی سیاسی و مەعنەوی یەکەمین جیاوازی لەنێو ئەم هەلومەرجانە وەردەگرێت. لەبەرئەوەی شۆڕشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لەچواردەورەی ژن شێوە دەگرێت، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن تایبەتمەندێتیەکانی کۆمەڵگای دایکسالاری زاڵە. باوەڕبوون بەهێزی دایک بەرهەمی ئەم سەردەمەیە. پیاو تادوارادە بێکاریگەر و گشتی یە. هەرچی "ژنە، دایکە"خاوەنی رۆڵی یەکلاکەرەوەیە و گەوهەرە. ئەم رەوشە وەکو رەنگدانەیەکی مەعنەوی بناخەی کولتووری خوداوەندی ژنە. خوداوەندی ژن لەگەوهەری خۆیدا گوزارشتی گشتی تایبەتمەندێتی ئەو ژنەیە کە شۆڕشی نیۆلیتیکی ئەنجامداوە. کاتێک وشیاری ئەم شۆڕشە مەزنەی مرۆڤایەتی بەسەر جیهانی هزردا رەنگدەداتەوە، رێگا لەپێش شێوازێکی شکۆداری و پیرۆزکردن دەکاتەوە کە خوداوەندی ژن دەکات بەناوەند. خوڵقکاری، ناسینی دانەوێڵە و چاندن و ماڵیکردنی ئاژەڵ، دروستکردنی قاپ و قاچاخ، چنین و دروستکردنی خانوو، بەخێوکردنی منداڵ، چاوەڕوانیکردنی دارەکانی میوە، لەمیانەی رۆڵی سەرەکی ژنانەوە ئەنجام دەدرێت.

### ا. مێخوداوەندێتی، جەوهەری شۆڕشی نیولۆتیک گوزارەیە لە سەرکەوتنی تایبەتمەندیەکانی ژن.

ژیان لە دەوروبەری ژن ـ دایکدا رێکدەخرا. لەو سۆنگەیەوە پەرچووەکان دەکران بە موڵکی ژن؛ هەر لەو چوارچێوەیەشدا ژن بە مێخوداوەندێتی گەیشتبوو. مێخوداوەندی هەڵکشانێک نەبوو بەهێزی قەبە بەدەست هێنرابێت، شکۆداربوونێکی زهنی پەیوەست بە فەراهەمکردنی ژیان و خاوەندارێتیکردنی بوو. کۆمەڵگای نیولیتیک بەدەست، دڵ و زهنی ژن ـ دایک دادەهێنرا. سەرجەم دۆزینەوەکانی پەیوەست بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری مۆرکی ئەوی پێوە بوو. یەکەمین داستانی باسی تێکۆشانی مێخوداوەندی ئوروک ـ یەکەمین شار، دەکات لە بەرامبەر یەکەمین نێرخوداوەندی فێڵبازو تالاًنکار ئەنکی بۆ بەدەستهێنانەوەی " ١٠٤ دانە دۆزینەوە و داهێنانەکان" ی کە بە بەهاکانی خۆی ناودەبرد، گوزارشت لەو راستیە دەکات. وێڕای دەستپێکردنی قۆناخی شار بەلاًم کاتێک هێشتا ژنێک خوداوەندی یەکەمین شارە و لەگەڵ نێرخوداوەندەکاندا ململانێ دەکات هەڵگری مانایەکی قووڵە. ئاماژە بە هێزی کولتووری ژن ـ دایک، بزووتنەوەکەی و بەرخودانەکەی بەرامبەر بە شارستانی دەکات. ئەستەمە لەمیانەی زهنیەتی شارستانی پیاوسالاری رۆژی ئەمڕۆمان بتوانین کولتووری دایک ـ ژن شرۆڤە بکەین. ئەو کولتوورە راستیەکە هەزاران ساڵ بەردەوام بووە. پەرەسەندنی سیستەمی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە بە شێوەی سیستەمێکی پیاوسالاری ئەو راستییە دەسەلمێنێت. هەروەکو لە سروشتدا جێگای باسە بەگوێرەی ئەوەی لە کۆمەڵگاشدا هەموو شتێک بە دژەکەیەوە پەرەدەسەنێت، ئەوا پەرەسەندنی پیاوسالاری سیستەمی شارستانیش تەنیا لەمیانەی سیستەمی نفوزی دایک ی ژن مانایەکی دەبێت.

لەسەر بنەمای ئەم شرۆڤانە دەتوانین باشتر لە واتای ئەو میتافیزیکە ئیلاهییە تێبگەین کە لە میانەی پشت بەستن بە پیرۆزی و ژیانی هاوبەش ـ کۆمەڵکارییەوە لە دەوروبەری ژن ـ دایکدا پێشکەوتووە. وەچەخستنەوە، بەخێوکردن، میهرەبانی و پێگە گەورەکەی دایک کە وەکو سروشتە، فاکتەری سەرەکی کولتووری ماددی و مەعنەوییە. مێردایەتی پیاو نەک هەر دیار نییە، هێشتا "سێبەر"یشی لەسەر کۆمەڵکاری کۆمەڵگا نییە، نابێت. شێوەی ژیانی کۆمەڵگا رێگای پێنادات. هەر بۆیە تایبەتمەندییەکانی لە جۆری رەگەز، مێردایەتی، خاوەن موڵک و دەوڵەت کە بۆ پیاو دەگێڕدرێنەوە تەواو کارەکتەرێکی کۆمەلاًیەتییان هەیە و دواتر پێشکەوتوون. کۆمەڵگا بە واتای دایک ـ ژن، منداڵ و براکانی ژن دێت. هەرچی ئەو پیاوەیە کە شیمانەی بەرئەندامێتی مێردی لێدەکرێت، لە دەرەوەی سوودی پیاوێتییەکەی، ئەگەر بەهرەیەکی هەبێت، بۆ نموونە لە میانەی نێچیروانی، کۆکردنەوەی رووەک و ماڵیکردنی ئاژەڵەوە خۆی بسەلمێنێت وەکو ئەندام دەبینرێت. هێشتا ماف و هەستێکی لە جۆری مێردی ژنەکەمم، باوکی منداڵانی

**خۆمم وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پەیدا نەبووە. نابێت لەبیری بکەین؛ هەرچەندە ناکرێت بگووترێت دایکایەتی و باوکایەتی رەهەندێکی دەروونییان نییە، بەڵام لە بنەڕەتدا زاراوە و دیاردە و تێگەیشتنێکی کۆمەڵایەتین.**

**سەردەمی کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند: بەهۆی هەبوونی بونیادێکی ئاڵۆزتر سەبارەت بەبابەتەکانی حەوانەوە، خۆراک، پۆشاک، زۆربوونو پاراستن جۆرێک لەڕاستیگەلی کۆمەڵایەتی جێگای باسن کەتوانا و چوارچێوەی مانای زۆر زیادی کردووە. کۆک و هاوسەنگ لەگەڵ چوارچێوەی مانا پەرەسەندنی سەردەمێکی حەقیقەت دەست پێدەکات. بەتایبەتیش سەردەمی حەقیقەتی میتۆلۆژی، ئایینی و هونەری بەهەموو پیرۆزیەکەیەوەدێتەسەر شانۆ کە لە دەوروبەری دایک ـ ژن پەرەی سەندووە. زمانەکان گەشەدەکەن. مێژی گوزارشتی میتۆلۆژی، ئایینی و هونەری سەردەمێک دەست پێدەکات کەبەها رەسەن و راستەقینەکەی بەرزە. شکۆدارترین چاخی بەر لەمێژووەوە. ئەو سەردەمەیە کە بۆ یەکەمین جار کۆمەڵگا خۆی وەک حەقیقەتە پیرۆزەکان پیشان داوە(لەمیانەی پەیڕەوەمیتۆلۆژی، ئایینیو هونەریەکانەوە). تا ئێستاش مرۆڤایەتی میراسی ئەو سەردەمەدەخوات. دوو شێوەکەی دیکەی حەقیقەت لەسەرڕووی هەمووشیانەوەدانایی فەلسەفی و زانستی پزیشکی لەو سەردەمەدا بناخەی دانراوە. پزیشکی و دانایی ژن وەک حەقیقەتە بە کاریگەریەکانی ئەو قۆناخەشوێنێکی گرنگی لەژیاندا گرتووە. هۆکاری زاڵبوونی مێخوداوەندی لەو قۆناخە بۆ ئەو هێزە دەگەڕێتەوە کە ژن لە پێنج بوارە گرنگەکەی حەقیقەتدا بەدەستی هێنابوو. بێگومان رۆڵە سەرەکیەکەی لە پەرەپێدانی ئابووری ماڵ و کشتوکاڵ لەژێر بەدەستهێنانی ئەم هێزەشاراوەیە.**

**جڤاتەکان لەناواخنی زهندا بەردەوام بەدوای ئۆبژەی پێداویستییە ماددییەکاندا گەڕاون و خواستوویانە پێشی بخەن؛ خواردن، حەوانەوە، زۆربوون و پاراستن نیگەرانییە سەرەکییەکانیان بووە. لەسەرەتادا بەهۆی ئەم پێداویستیانەوە رازیبوون بەو خواردنەی دۆزیویانەتەوە لە ئەشکەوتەکاندا حەواونەتەوە، لە کەنارئاو و ناو دارستانەکاندا باشتر خۆیان پاراستووە و لەپێشینەییان بەدایک داوە کە وەچەی خستۆتەوە. پێبەپێ نێچیروانیش دەکەوێتە گەڕ. هەم پاراستن، هەم گۆشتخواردن پەرە بەم کولتوورە دەدات. بەڵام هەر لەسەرەتای بە کۆمەڵگابوونەوە ئەو گرژییەی لەنێوان خواردەمەنی کۆکردنەوەی ژن و نێچیروانێتی پیاودا هەیە، نیشانماندەدات کە پەرەسەندنی کولتووری جیاوازیان جێگای باس بووە. لە هەردوو لایەنیشەوە پێشکەوتنێکی یەک لایەنە بەدیدێت، یەکێکیان "شێرە پیاو" ئەوی دیکەشیان "چێڵە ژن" وەکو کولتوور هەنگاو هەنگاو بەرەو پێشەوە دەچن. بەمجۆرە بناخەی یەکەمین چەمکی ئابووری جیاواز دادەنرێت. لەچاخی نیولیتیکدا کولتووری ژن دەگاتە لوتکە. پاش دوا قۆناخی سەهۆڵبەندان، لە ساڵانی ١٥٠٠٠ پ.ز بەدواوە، بەتایبەتیش لە بنارەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆسدا، جۆرە دەوڵەمەندەکانی رووەک و ئاژەڵ کە بەهۆی ئەم کولتوورەوە کۆکراوەتەوە، رێگا لەپێش گریمانەی ژیانێکی هاوشێوەی بەهەشت دەکاتەوە.**

**ئەم قۆناخە وەک رووباری دایکی پێشکەوتنی کۆمەڵگا کە تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بووە، لەمیانەی شارستانی و مێژووی نووسراوەوە دەگۆڕێت و بەمجۆرە مۆرکی خۆی لە جیهانگیری دەدات. ئەو پێشکەوتنانەی تا رۆژگاری ئەمڕۆمان پشت بە گروپەکانی زمان بەدیدێت بەرهەمی ئەم قۆناخەیە. تاکە خاڵێکی گرنگ کە لەم مێژووە درێژخایەنەی مرۆڤایەتیدا دەتوانرێت بۆ سەرمایەداری بگووترێت ئەوەیە کە، کولتووری نێچیروانی پێبەپێ پیاوی کرد بە هەژموونگەرا. هێندەی دەستنیشانکراوە لە ساڵانی ١٠٠٠٠ پ.زدا کولتووری نیولیتیک کە فورسایی ژنی پێوە دیاربووە بۆتە هەمیشەیی. لە قۆناخی کۆکردنەوەی خواردەمەنیدا لە ئەشکەوتەکان دەردەکەون و دەربازی جۆرێک لە سابات (نزیکی ئەشکەوت)دەبن، تۆوی رووەک و دانەوێڵەکان دەچێنن، زۆربوونی دانەوێڵە هەنگاو بەهەنگاو رێگا لەپێش شۆڕشی کشتوکاڵ و گوند دەکاتەوە.**

**لەمیانەی ئەو هەڵکۆڵینە شوێنەوارناسیانەوە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەنجامدراون، دەرکەوتووە کە ئەم کولتوورە لە تەواوی مێزۆپۆتامیای سەروو، بەتایبەتیش لە کەوانەی ناوەوەی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس (برادۆست، گارزان، ئەمانۆس و بنارەکانی ناوەوەی چیای تۆرۆس، نەوالی چۆری، چایۆنۆ، کولتووری چەمێ خەلان) پێشکەوتووە. ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر سنوورداریش بێت زێدە بەرهەم کەڵەکە دەبێت.**

ئەگەر وەک زاراوەش نەبێت، بەڵام وەک ناوەڕۆک دەشێت یەکەمین ئابووری بۆ ئەم شێوازەی کۆکردنەوە بگەڕێنرێتەوە. هەروەکو دەزانرێت وشەی ئیکۆ ـ نۆمۆس بەزمانی لاتینی واتای یاسای خێزان و خانە دەبەخشێت. لەگەڵ پەیدابوونی یەکەمین خێزانە کشتوکاڵییە جێنشینەکانی دەوروبەری ژن و ئەگەر بەشێوەیەکی کەمیش بێت بە شاردنەوە و عەمبارکردنی خۆراکە خۆڕاگرەکان، ئابووری لەدایک بوو. بەڵام ئەم کۆکردنەوەیە بۆ ماڵەوەیە، نەک بۆ بازاڕ و بازرگانان. ئەوەی مرۆییە و ئابووری راستەقینەیە، دەبێت ئەمەیان بێت. لە ڕێگای کولتوورێکی بەربڵاوی بەخشینی دیارییەوە ئەم کەڵەکەبوونە لەرەوشی مەترسی چاوتێبڕین دەردەخرێت. لەوانەیە پرەنسیپی "موڵک تەماع دێنێت" لەم قۆناخەوە مابێتەوە. کولتووری دیاری شێوەیەکی گرنگی ئابوورییە. تا دواڕادە لەگەڵ ئیقاع و ئاوازی پەرەسەندنی مرۆڤیشدا دەگونجێت.

دەشێت کولتووری قوربانیش لەم قۆناخەوە دەستی پێکردبێت. بابەتێکی دەرکی پێدەکرێت ئەوەیە: ئەو زاراوەی بە خوداوەند بەناو دەکرێت لە راستیدا یەکەمین شێوازی گوزارەی ڕێزگرتنی جڤاتەکانە بۆ ناسنامەی خۆیان بەرامبەر ئەو بەروبوومەی زیادیکردووە. بەپیتی بەرهەمداری شوکرانەکردن لەگەڵ خۆیدا دەبێت. بەگوێرەی ئەوەی سەرچاوەکەی بۆ گەشەکردنی شێوازی جڤات دەگەڕێتەوە، بوون بە خاوەن ناسنامە، شکۆدارکردن، نزاکردن، عیبادەت و پێشکەشکردنی وەک زیادبوونی پێشکەوتنەکانی دونیای زهنی، ئەو فاکتەرە کولتوورییانەن کە بە قووڵی گرێدراوی شۆڕشی کشتوکاڵین. دۆزینەوە شوێنەوارناسییەکان بەشێوەیەکی زەق ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن. بەشێوەیەکی کۆنکریتی زاراوەکانی دایکە ـ خوداوەند و دایکی پیرۆز فاکتەری سەلمێنەرن. بەربڵاوی وێنە و پەیکەری بچووکی ژنان لەسەرووی فاکتەر و بەڵگە سەلمێنەرەکانەوە دێن.

رۆڵ بینینی ژن لەسەنتەری ئابووریدا خاسیەتێکە دەرکی پێدەکرێت. چونکە منداڵی دەبێت و بەخێوی دەکات. ئەگەر ژن لەئابووری تێنەگات ئەی کێ تێدەگات! کاتێک بەگشتی لەمێژووی شارستانی بەتایبەتیش لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ژن لە ئابوری بەدەرنرا، لەبەر ئەم هۆکارەئابوری ـ کەپیاوەزەبەلاحەکان زیاترین یاری پێدەکەن ـ بوو بەگلۆڵەی کێشەکان. ئەم یارییەی هیچ رایەڵەیەکی سروشتی لەگەڵ ئابوریدا نییەو تەنیا لەڕێگەی چاوچنۆکی و داخوازی بەدەستهێنانی ئەوپەڕی هێز و قازانجەوە خوازیارە تەواوی هێزەکانی ئابووری لەسەرووی هەمووشیانەوە ژن بخاتەژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، لەئەنجامدا ڕێگا لەپێش هەر جۆرەهێزێکی پلەداری، دەسەلات و دەوڵەت دەکاتەوە کە وەک تەنێکی نەخۆشی لەسەر کۆمەڵگا گەورە بێت، بە مجۆرەش بە قۆناخێک گەیشتووە کە چیتر ناتوانێت بەردەوام بێت. دوای ژن تەواوی ئەو توێژانەی بە ئابوری راستەقینەوە سەرقاڵن لە سەرووی هەمووشیانەوە جووتیاران، شوانکاران، پیشەگەران و بازرگانەبچووکەکان لە لایەن ئامێر و دامەزراوەکانی پاوانی سەرمایەو دەسەلاتەوەهەنگاو بەهەنگاو لە ئابووری بەدەرنران و بەمجۆرەدۆخ و زەمینەی غەنیمەت و تالانکاری تەواو ئافرێنراوە. لێرەدا رووبەڕووی بابەتێکین کەپێویستی بەزۆرترین رۆشنکردنەوەهەیە.

لە کاتێکدا کۆمەڵگای نوێ بە زۆری پشت بە ژیانی گوند دەبەستێت، پەیوەستبوونی کلان بۆ پەیوەندی ئەتنیکی دەگۆڕێت. ئەگەر چوارچێوەی زهنییەتێکی واتادار نەبێت شێوە نوێکانی ئەم پێکهاتە مادديانە بەڕێوە ناچێت، تەنانەت دەست پێناکات. لەگەڵ ئەوەی ناسنامەی کۆمەڵگای کۆن کلان "تەوتەم" بەردەوام دەبێت، ئەوا شێوە سیمبۆلی نوێی کۆمەڵگای نیولیتیک کە"دایکە ـ خوداوەند"ە بەرجەستە دەبێت، ئەمەش وەرچەرخان و زمانی زهنییەتی نوێیە. لە کاتێکدا شێوەی تەوتەم پێ بە پێ کەم دەبێتەوە، وێنە و شێوەی دایکە ـ خوداوەند دەوروبەردەتەنێتەوە. ئەمەش هێمایە بۆ بەرزبوونەوەی رۆڵی دایکە ـ ژن. ئەمە لە لایەنی ئایینیەوە قۆناخێکی لەپێشترە، زاراوەگەلێکی زۆر دەوڵەمەند لەگەڵ خۆیدا دێنێت. لە زماندا پێشگر و پاشگری مێینە دەردەکەوێتە پێش. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن رۆڵی سەرکێشی و لەپێشینەیی مێینە لە پێشگر و پاشگری زمانی هێما دەنگییەکاندا بەردەوام دەبێت. تەنانەت لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەم تایبەتمەندییە لە زۆر زماندا دەبینرێت. لەگەڵ دایکە خوداوەند کۆمەڵگابوون بە پیرۆزییەکی قووڵ دەگات. کۆمەڵگای نوێ، بە واتای زاراوە و ناولێنانی نوێ دێت. ئەو پرۆسە(قۆناخ)یەی بە شۆڕشی زهنی ناومان برد لەبەرئەوەی پێویستی بە خوڵقکارییە، پێویستە بیخەینە ناو کۆمەڵناسی ئازادییەوە. بابەتێک کە مێژووناسە لەپێشینەکان لە بارەیەوە کۆکن: زۆر دووبارە بوونەوەی ئەم پرۆسەیەیە. ئەمەش بە واتای هەزاران دیاردە، هەزاران شۆڕشی هزری و ناو دێت. ئەمە زۆر لە شۆڕشە زهنییەکەی ئەوروپا فراوانترە، تەقینەوەیەکی تێدایە کە هەوڵێکی راستەقینە و

خولقکارانە دەخوازێت. لە لایەن مێژووەوە ئەو راستییە دەستنیشان کراوە کە تەواوی ئەو زاراوە و دۆزینەوانەی ئەمڕۆ بەکاریان دێنین زۆربەیان لەو قۆناخەدا خولقێنراون.

ئەو کۆمەڵگایەی لەتەوەرەی دایک ـ ژن پەرەیسەند بەهۆی ئاواکردنی یەکەمین کۆمەڵگای خزمایەتی جێگای گرنگی و بایەخ پێدانە. خزمایەتی لەسەر بنەمای نزیکبوون لەدایک ـ ژن دەستنیشان دەکرێت. لە رێگای ئەو خزمایەتیەوە لە کلانی سەرەتاییەوە بە یەکەمین کۆمەڵگای قەبیلە دەگەن. قەبیلە بەو سیفەتەی شێوەی کۆمەڵگایەکی بەهێزو خاوەن ناسنامەیەکی رەسەنە تا ئێستاش شوێنپەنجەکەی بەردەوامە. ئەو زمان، ئایین، میتۆلۆژیا، هونەر، دانایی و دەزگا زانستییە رەسەنانەی کاریگەرییەکەیان تا رۆژی ئەمرۆشمان هاتووە یەکەمین بریسکە و رۆشنایی خۆیان لە هەناوی ئەو کۆمەڵگایەدا بڵاوکردەوە. سەرهەڵدان و دەرکەوتنی راستەقینەی ئامرازەکانی لەجۆری رستن و چنین، دەفر و دیبزە، کلان، دەستاڕو ئاواکردنی خانوو قەرزداری کۆمەڵگای ئەو قۆناخەیە. وابەستەبوونێکی پیرۆز بە سروشت و ئاواکردنی وڵاتی بچکۆلانە بەرهەمی ئەو کۆسمەڵگایەیە. دەشێت لەسەدا نەوەدی "یەکەمین"ەکانی دەرهەق بەژیانی کۆمەڵگا داهێنراون بۆ کۆمەڵگای ئەو قۆناخەبگەرێنرێتەوە.

بەپێی زەمەن و شوێن بڵاوبوونەوەی شێوازە رێکخستنییە کۆمەڵایەتییەکانی تیرە سەرەتاییەکان (قلان) هەروەها هەنگاو بە هەنگاو بوونی بەخاوەن قەبارەو هەمەرەنگی پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. لەو پێدراوانەی لەبەر دەستدان دەستنیشان دەکرێت کە لەئاستی پیاوان نارەحەتییەک بەرامبەر ئەو کۆمەڵەیە پێشکەوتووە کە لەدەوروبەری ژن ـ دایک گەورە بووە و ناسنامەی خۆی تۆکمە کردووە. ئەم ناکۆکییەی کەلەسەرەتا زۆر لاواز بوو چەندەی دەهات پەرەیدەسەند. پێشکەوتنی نێچیروانی شانبەشانی دەرخستنەپێشی هێزی جەنگاوەری پیاو زانیارییەکانیشی زیاد دەکات. لەسەر ئەم بنەمایە پیاوە یەختیارە (تەمەندارە) بەرکەنارکراوەکان بەرەو ئایدۆلۆژیایەکی باڵادەستی هەنگاو دەهاوێژن و پەرەدەسەنن. بەتایبەتیش ئایینی " شامانیزم " بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئەم دیاردەیەمان نیشان دەدات. شامانەکان زیاتر نوێنەرایەتی نموونە سەرەتاییەکانی راهیبێتی دەکەن. بەشێوەیەکی زۆر سیستەماتیک بەرامبەر ژنان دەکەونە جوڵە و دەخوازن سیستەمی ماڵ پێشبخەن. بەرامبەر سیستەمی ماڵداری کە پێشتر ژن ـ دایک پێشیخستبوو لەمیانەی ئەو مۆڵگە ساکارانەی بەشێوەی نیو دڕندە پەنای بۆ دەبەن پیاو دەتوانێ لەرێگای شامانیزمەوە سیستەمێکی ماڵ پێکبهێنێ، رێککەوتنی پیاوە یەختیارە خاوەن ئەزموونەکان لەگەڵ شامانەکان، گۆڕانکارییەکی زۆر گرنگە لەمیانەی ئەو فشارە ئایدیۆلۆژییەی دەیخەنە سەر ئەو کوڕە گەنجانەی لەگەڵیاندان و چەندە دەچێ رێگەیان لەناو کۆمرۆڤەکان بەهێزتر دەبێت. ئیتر ناوەرۆکی بەهێزبوونی پیاوان دەبێتە جێی گرنگی و بایەخپێدان. پاراستنی تیرە(قلان) لەبەرامبەر دەرەوەو تەنانەت بۆ نێچیروانیش ناوەرۆکێکی سەربازی هەیەو پشت بەکوشتن و برینداركردن دەبەستێت. ئەمەش سەرەتای دەستپێکردنی کولتووری شەڕە. کاتی مان ـ نەمان جێگای باس بێت، پێویستی وابەستەبوون بەدەسەڵات وپلەداری لەگەڵ خۆی دێنێ. بەتواناترین کەس، قسەو دەسەڵاتەکەی دەیگەیەنێتەپێگەی پایەدارترین کەس. دەستپێکردنی کولتورێکی جیاوازجێگای باسە کەبەرامبەر کولتوری ژن ـ دایک باڵابوونی پێشخستووە. ئەم گۆڕانکارییەی پلەداری و دەسەڵات کەپێش کۆمەڵگای چینایەتی رویدا یەکێک لەخاڵە هەرەگرنگەکانی وەرچەرخانی مێژوویی پێکدێنێ. لەبواری ناوەرۆک لەکولتووری ژن ـ دایک جیاوازترە، لەم کولتوورە سەرەتا شێوازی کۆکردنەوەی بەرهەم، دواتریش بەرهەمهێنانی دانەوێڵە پەیرەو دەکرێت، ئەمانەش چالاکی ئاشتیانەن وپێویستییان بەشەڕ نییە. هەرچی چالاکی نێچیروانی پیاوانە پێویستی بەکولتووری شەڕ و پشت بەدەسەڵاتێکی توند دەبەستێ. ئەنجام ریشە داکوتانی دەسترۆیی باوکسالارییە.

لە ساڵانی ٤ هەزار پ.ز قۆناخی گاسن بۆ کێڵگەکان دەستپێیکرد و شوانکاری گرنگی پێدرا، جێگای ژن لەقۆناخی بەرهەم هێناندا تەنگ کرایەوە. بەپێی دەربازبوونی کات لەماڵدا دەمێنێتەوە و ئەمەش قووڵ دەبێتەوە تا دەگاتە رۆژگاری ئەمرۆمان. هەربۆیە شتێکی مسۆگەر و حاشاهەڵنەگرە کە لەکاتی نووسینی مێژوودا شوێنگەی ژن بە گوێرەی ماف و راستی خۆی دیارنەکراوە و زۆر دووری ئەم راستییەیە. لەگەڵ قۆناخی شارستانیبووندا باڵادەستی پیاو پتەوبوو ئیتر لەگەڵ دەربازبوونی کات ژن لەنێو دام و دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگای چینایەتی بەدەرنرا و ئەمەش بووە بناخەی نووسینی پەرتووکەکانی "مێژووی بەدەر لە ژن". لە ئەنجامی ئەو نایەکسانییەی لە نێوان رەگەزەکاندا هەیە چەواشەکارییەکی مەزن بەناوی مێژوو پێشکەش دەکرێت.

کۆمەڵگای نیولیتیک کەی کەوتە گەرووی تەنگەبەرییەوە یاخود هەوڵی تێپەڕ کردنی درا؟ دەشێت لەسەر بنەمای هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان هەندێک شرۆڤە پێش بخرێت. دەشێت پیاو لە میانەی بەلاوەنانی لاوازییەکەی و بوونی بەڕاوکەرێکی سەرکەوتوو و بەیەکەوە لەگەڵ دەست و پێوەندەکەی بە پێگەیەکی بەهێز گەیشتبێت، بەمەش هەڕەشەی لە سیستەمی دایکسالاری کردبێت. دەشێت بەهرەی بەخێوکردنی ئاژەڵ و رووەک رێگای لە پێش ئەم هێزە کردبێتەوە. قورسایی تێبینییەکانمان پیشانی دەدات کە کۆمەڵگای نیولیتیک لەبەر هۆکارە دەرەکییەکان توێنراوەتەوە.

## ٢. داکشانی دەنگی ئینانا، داکشان و بێ کاریگەربوونی دەنگی ژن بوو.

ململانێی نێوان خوداوەندە ژنی ئوروک ئینانا ( رەگی خۆی لە دایکە ـ خوداوەند ستار ـ عەشتاری میرۆپۆتامیایی سەروو وەردەگرێت) و خوداوەندە پیاوی ئەریدۆ ئەنکی (یەکەم خوداوەندی پیاوی شار) لەملایەنەوە زۆر بەکاریگەرە. ئینانا هەوڵدەدات بسەلمێنێت چۆن و لەبەرچی تەواوی مافە ئیلاهییەکان هی دایکە ـ خوداوەندە (١٠٤ ما بەناوبانگەکە، ٩٩ فەزیلەتەکە، بەهرە، داهێنان) بەرامبەر بەمەش ئەنکی وەعزی ئەوە دەدات کە ئەمە گرنگی خۆی لەدەست داوە، وەک بەڵگەی گوێڕایەڵیش داوا دەکات گوێ لە باوکی ( لە کاتێکدا خۆی وەک خوداوەندی ـ باوک ـ پیاو رادەگەیەنێت، ئیتر ئینانای کۆنە خوداوەندەژنی کردۆتە کچ ـ ژنی خۆی ) بگرێت.

کاتێک ئەنکی خودای فێڵباز و زانای کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەر، تەواوی بەها گەوهەریەکانی خواوەندی ژنی سۆمەریەکان "ئینانا" و تەواوی ئەو بەهایانە دەبات، کە لە کۆمەڵگای نیۆلیتیکدا خوڵقاندوویەتی، لە راستیدا هەموو شتێکی رەگەزی ژن لەناو کۆمەڵگا دەبات و دەستی بەسەردا دەگرێ. هەربۆیە شتێکی رێکەوت و لە خۆرایی نییە کە یەکێک لە داستانە گرنگەکانی میتۆلۆژیا کە لە بیر ناکرێت، ئەو داستانەیە کە گوزارشت لە کاروانی ئینانا دەکات کە لە ئورگەوە بەرەو ئەریدۆ ئەنجامی دەدات و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە دەگەڕێتەوە و تەواوی سەد و چوار یاسایەکانی "ما" لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە. ئەمەش گێڕانەوەی ئەفسانەیی و ئایینی و ئەدەبی ئەو پەیوەندی و ناکۆکیانەی نێوان خواوەندە ژن و پیاوەکانە کە رەنگدانەوەی رەوشی ناو کۆمەڵگایە و رێگا لەپێش چ جۆرە دانوستاندن و پێکدادانێک دەکاتەوە. بەدەستی مرۆڤ نییە بەرامبەر ئەم کارە جوان و رێک و پێکەی وێژەزان و نووسەرانی سۆمەر مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ. لە راستیدا ئەمە گەوهەری ئەدەبیاتە.

خوداوەندە فێڵبازەکان بەردەوام دزیان و فرۆشتیان. لە سایەی ئەوانەوە ژن هەموو شتێکی لەدەستدا. کاتێک هەموو شتێکیان لەدەست ژن دەرهێنا، ئیتر مەزنترین هەژاری کۆمەڵگا وەکو قەدەرێک بەڕێوە دەچێت. دواتر مرۆڤیان کرد بە کۆیلە. هەموو جۆرە شێوازێکی زۆرداری و چەوساندنەوەیان لەمیانەی ساختەکاری، بەسەریاندا کرد بە مافێکی پیرۆز. ئەوانەی دواتر بەردەوام ئەم دوو کارە نالەبارەیان رتوش کرد و بریقەداریان کرد، وەکو باشترین هونەری ژیان دەستنیشانیان کرد. بە شێوەیەکی زۆر تۆقێنەرانە کوشتاریان ئەنجامدا، بە شێوەیەکی سەیر ئامرازەکانی کوشتنیان پێشخست. ئەو خوداوەندە ژن و پیاوانەی کە لەگەڵ مرۆڤدا دەژیان و بەردەوام هێزی پێدەبەخشین، هەموویان کردن بە بکوژ و تۆڵەسێن. ژیانی بەهەشتی جیهانیان کرد بە دۆزەخ. بەمجۆرە رۆژهەڵاتی ناوین نەفرەتی لێکرا. بەمجۆرە وڵاتەکان بوون بە خاکی نەزۆک و مردوو. لەگەڵ ئەوەی لە سیستەمی باوکسالاری دەوڵەتی سۆمەردا خوداوەندی ژنی ناوچە شاخاوییەکانی باکوور و باشوور، کە سەرەتا بە "نین هورساک" دەناسرا و لەنێو کوردانیشدا بە ئەستێرە دەناسرێ، کەوتە پیلانی دووەم و شانبەشانی پێشکەوتنی کۆیلایەتی و لە ئەنجامی لەدەستدانی هێز لەلایەنی ژن و شکاندنەوەی بە لایەنی رەگەزی دیکەدا، بووە مەیدانی پێکدادانی مەزن. لە سەردەمی سۆمەریەکاندا ژن رێزی لێدەگیرێت و هێشتا هەموو شتێکی لەدەست نەداوە؛ لە سیستەمی خوداوەندی پیاواندا (لە سۆمەر) ژنان دەستیان بەسەر نیوەی بوارەکاندا گرتووە. "نین هورساک" بە شێوەیەکی دژوار و رووبەڕوو لەگەڵ خوداوەندە فێڵباز و وشیارەکەی پیاوان ئەنکی لەنێو

ململانێدایە و بەشێوەیەکی گشتی ئەم ململانێیە بە ڕێککەوتن ئەنجامگیر دەبێت. کاتێک دوای ئەوە وەکو ئینانا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، کاتێک وەکو ژنە خوداوەندی خوڵقێنەری نیۆلیتیک "ماکانی" خۆی واتە داهێنانەکانی خۆی لە شارۆچکەی جێنشینی ئەنکی ئەریدۆ بۆ شارۆچکەی خۆی ئورک دەگەڕێنێتەوە، بەمەش دەبێتە خاوەنی سەرکەوتنێکی شکۆمەندانە.

یەکێک لەو پێشکەوتنە گرنگانەی لە سایەی پرەنسیپەکانی کۆمەڵگای سۆمەردا هاتۆتە ئاراوە، ئەو ئاستەیە کە جیاوازی ڕەگەزی پێی گەیشتووە. ئەو هێزەی کە سۆمەر ئافراندنی و ئەو هێزەی بەسەر بەرهەمی سەردەمی نیۆلیتیک زاڵ و باڵادەستە، ژنە. چاندن و ماڵیکردن تا ڕادەیەکی زۆر داهێنانی ژنە. هەروەها لەبەر ئەوەی سروشتی ژن وەڵامی پێداویستییەکانی داوەتەوە بۆیە سیستەمی ژیانی جێگیر، واتا شۆڕشی گوند، مۆرکی ژنی پێوەیە. دۆزینەوە و داهێنانی گلکاری، تەون کردن، هاڕینی دانەوێڵە ئەو کارانەن کە ژن پێشەنگایەتی کردووە. خێزان لە دەوروبەری ژن کۆبۆتەوە و ڕەچەڵەک بە گوێرەی ژن دەستنیشان کراوە. سیستەمی دایک سالاری باڵادەستە. ئەمەش واتای ئایدیۆلۆژی خۆی لەو بیر و باوەڕە ئایینیانە دەبینێت کە خوداوەندەکانیان ژنە و نموونەی لە خێزان و ئەستێرەکاندا دەبینرێ. واتا و گوزارشتی ئایدیۆلۆژی ئەو جیاوازیە ڕەگەزیەی لە کۆمەڵگای سۆمەریەکاندا شانبەشانی جیاوازی چینایەتی پێشدەکەوێت، بە شێوەیەکی چڕوپڕ لەمیتۆلۆژیادا دەبینرێت. ڕەنگدانەوەی جیاوازی ستاتۆ لێرەدا زۆر زەق و بەرچاوە. لە کاتێکدا شوێنگەی خوداوەندە ژنەکان سەرەتا لەپێشەوە دەهات، وەلێ لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا لاواز دەبێت؛ لە سەردەمی بابلیەکاندا سەرەتا لە کەسایەتی "تیامات" لێدانێکی کوشندەی بەردەکەوێت. کوڕی بچووک "مەردۆک" نوێنەرایەتی کولتووری پیاوسالاری دەکات کە بەخێرایی بەرەو تاکخوداوەندی هەنگاو دەهاوێژێت. حەزرەتی ئیبراهیم کە دواتر دێت و ئەم کولتوورە بەبناخە دەگرێت، ڕۆڵی باپیری ئەو پێغەمبەرانە دەبینێت کە تاکخوداوەندی بەبنەما دەگرن. لەکاتێکدا ژنان لە ڕابردوودا بە ئەندازەی ڕاهیبی پیاو لەپەرستگاکان بەکاریگەر بوون، ئەمجارە لەماڵدا دەکەوێتە پیلانی دووەم. یەکەم جێگای سۆزانیەکان داهێنانی سۆمەریەکانە کە بە "موساکاتدیم" ناوزەددەکرا. لێرەدا شوێنگە و ڕۆڵی ژن بە ئەندازەی دووەمین شەپۆلی شارستانیەت نەکەوتووە. لە تەواوی میتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا ستاتۆیەک (پێگەیەک) ڕەنگدەداتەوە کە نزیکە لەتەبایی و ڕێککەوتن.

لاوازبوونی ستاتۆی ژن و لەدەستدانی ئەو شوێنگە و ڕۆڵەی لە ئەنجوومەنی خوداوەندەکان ـ پانتائۆن ـ هەیانبوو، لەمیانەی گێڕانەوەیەکی میتۆلۆژی شیعرئامێزانە پێشکەش دەکرێت. هەروەها لە ئایینی تاکخودایی کە هەنگاوێک لەپێشترە هەم لەلایەنی دەربڕینی ئایدیۆلۆژی و چەواشەکردن و هەم لەنێو کۆمەڵگادا ژن لەڕەوشی ڕەگەزێکدایە کە خراوەتە نێو ڕەوشی کۆیلایەتییەوە. لە هەموو بوارێکدا لە ناوخۆ داخراوبوون و داخستنی دەم و زمانی جێگای باسە. هیچ شوێنەوارێکی سەردەمی خوداوەندە ژنەکان نەماوە. لەبەر ئەوەی لەڕابردووشدا ئادەمی ناچاری ئەنجامدانی یەکەمین گوناه کردووە، بۆیە ئەو ڕەگەزە سەرەکیەی تاوانبار و گوناهبار کراوە بەرامبەر بەم ڕەوشە بەرپرسیارە. لێرەدا لەمیانەی میتۆلۆژی و لەڕێگای ئەو ئایینەی سەرچاوەکەی لەمیتۆلۆژیاوە دێت، باڵادەستیەکی زەق بەلایەنی ڕەگەزی پیاودا دەشکێتەوە و بەمجۆرە ڕەوایەتی پێدەدرێت و زاڵ دەکرێت. لە هەموو ئاستێکیشدا سەردەمی باڵادەستی پیاو شکۆدار دەکرێت و دەبێتە نوێنەرە پیرۆزەکەی ئایین. لێرەدا بە شێوەیەکی تەڵەکەبازی پێشخستنی مێژووی کۆیلەکردن جێگای باسە. کاتێک تەماشای میتۆلۆژیای سۆمەریەکان بکەین دەبینین لەکاتێکدا بابە "ئەنکی" وەکو بلیمەتی مەزن و فێڵباز لەمیانەی لۆژیکی ڕیککەوتن و تەبایی پێشکەوتووە، لەگەڵ دەرکەوتنە پێشی"بال"ی خوداوەندی بابل مەردۆک لە کەسایەتی "تیامات" هەموو جۆرە لێدانێکی کوشندەی لە خوداوەندی دایک داوە. داستانی خوڵقاندنی بابل "ئەنومائەلیش" خاوەنی گرنگییەکی دوو لایەنیە. کارەکتەری ڕەهای پادشایەتی سەرهەڵدا و لەمیانەی یاساکانی حامورابی گرنگییەکی مێژوویی پەیدا کرد و ئەمەش تۆمارکراوە. لە لایەکی دیکەشەوە لە میتۆلۆژیای سۆمەریەکاندا ئەو یاسا ئایینیە مسۆگەرانەی کەس بۆی نییە دژی دەرکەوێت ڕێساکانی خۆی هێناوەتە ئاراوە. ئەمە نوێنەرایەتی قۆناخێکی مەزنی کۆیلایەتی ڕەگەزی و چینایەتی دەکات و ڕێگا لەپێش بەدەزگابوونێکی مەزن دەکاتەوە. لەمیانەی خوداوەندەوە بە ئەندازەیەکی هاوشێوە، بێ سنوور ڕێگای لەپێش دەسەڵاتێکی ڕەها کردۆتەوە. هەروەها ژن بۆ نێو کۆیلایەتی ماڵی تایبەت و گشتی قووڵبۆتەوە و ئەمەش گەیشتۆتە ئاستی بە دەزگابوون و یاسابوون. کاتێک قۆناخی ئایینە فرە خوداوەندە ژن و پیاوەکان دواکەوتنێکی مەزنی بەخۆیەوە بینی، ئەوا تاوەکو دوایی دەرگا

لەپێش مێژووی ئایینە مەزنەکانی تاکخودایی ئاوەڵا بوو، کە لە جوگرافیا و کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناویندا بە باپیرێتی حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل کراوە بەسەمبۆل.

لە چاخەکانی کۆمەڵگای بەر لە شارستانیدا یەکەمین ڕێکخستنی توندوتیژی "پیاوی بەهێز" تەنیا ئاژەڵەکانی نەخستە تەڵەزگەوە. هەمان ڕێکخستن بوو کە چاوی خۆی بڕیە تواناکانی خێزان ـ کلان کە بەرهەمی ڕەنجی ژێری سۆزداری (ڕووناکی چاوی) ژن بوون. یەکەمین ڕێکخستنی جددی توندوتیژییە. ئەوەی دەستی بەسەردا گیرا خودی ژن، منداڵەکانی و خزمەکانی دیکەی خوێنی بوون. کۆی توانای کولتووری ماددی و مەعنەوی هەمووان بوو. تالانکردنی یەکەمین ئابووری ماڵ بوو. لە تەواوی کۆمەڵگاکانی هەمان قۆناخدا دەبینین کە لەسەر ئەم بنەمایە شامانی شێوەی سەرەتایی ڕاهیب، ڕیش سپی (شێخ) خاوەن ئەزموون و ڕێکخستنی توندوتیژی پیاوی بەهێز دەست دەخەنە ناو دەستی یەک. یەکەمین و درێژخایەنترین هێزی پلەداری (بەڕێوەبەرایەتی پیرۆز) باوکسالاری پێکدێنن. ئاشکرایە تا قۆناخی جیابوونەوەی چینایەتی، ئاواکردنی شار و دەوڵەت ئەم پلەدارییە ڕۆڵێکی دیاری لە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بینیوە. ئوروک (وەرکا) کولتوورێکی ئاسایی مرۆڤایەتی نییە. سەرەتای پەرجویەکی نوێیە. دەنگی خوداوەندە ژنی ئوروک ئینانا تاکو ئێستاش سەرچاوەی بنەڕەتی سەرجەم داستان، هەڵبەست و گۆرانییەکانە. ئەو دەنگە، دەنگی ئەم کولتوورە سەرسوورهێنەیە. لە هەمان کاتدا دەنگی ئەو ژنەیە کە هێشتا پیاوی چەپەڵ پیسی نەکردووە. کولتووری ئوروک لە جوگرافیای خۆیدا گوڵی کرد. یەک بەدوای یەک دا ڤارچکئاسا لە شارەکان زیادی کرد. پشتێنەیەکی شارەکان دروست بوو. پیاوی فێڵباز و بەهێز ئەمجارە سەرچاوەی سەرەکی توانا و کۆکردنەوەی لە توانستە بازرگانییەکانی شاردا بینی کە لە زیادبووندا بوو. لێشاوێکی کولتووری بە ئاراستەی پێچەوانە دەستی پێکرد کە تا بناری چیاکان ڕۆیشت. ئەمەش قۆناخی سەرەتای قووتدانی جوگرافیای نیولیتیک بوو لەلایەن شارەوە. دەنگی کپکراوی ئینانا، دەنگی ژنی بێکاریگەرکراوە. ئیتر پیاوی فێلباز و بەهێز دەنگیشی بڵندە. پێشگر و پاشگری وشەکانی زمانی سۆمەری کارەکتەری ڕەگەزی مێینەیان هەیە. ئەم بابەتەش ڕۆڵی ژن لە ئاواکردنی زماندا پیشاندەدات. لێرەدا پێویست بەباسکردنی بەسەرهاتی جوگرافی ئەو شارستانیانە ناکات کە پشت بەتوندوتیژی دەبەستن. بەڵام ئەگەر بنووسرێت باش دەبێت.

ئەو داستانەی باسی تێکۆشانی خوداوەندە ژن ئینانا بەرامبەر بە یەکەمین خوداوەندە پیاوی فێڵباز و زۆردار (پیاوی دەسەڵاتدار کە بووە بەخوداوەند)ی دامەزرێنەری شاری ئەریدۆ "ئەنکی" دەکات، کە هەوڵدەدات ٩٩ جۆرە هونەر، شاکار و دۆزینەوەکانی ژنی لە دەست دەربێنێت، ئەو شەڕەی باسی دەکات، لە ڕاستیدا یەکەمین و بەکاریگەرترین داستانە. هەرچی شاژنەکانی ئینگلتەرا و هۆڵەندایە کە گوایە بەمیراتگری دادەنرێن، بوونیان بەسیمبوڵی ژنێک کە تەواوی چەپەڵییەکانی پیاوی فێڵباز و زۆردار تێیاندا ڕەنگیداوەتەوە و شێوەی گرتووە، وەک کورتکردنەوەی سەرجەم ئەزموون و بەسەرهاتەکانی شارستانی بۆ پوختەیەک وایە. بەرامبەر بە پیاوی بەهێز یەکەمین قوربانی ژن بووە. بەشێوەیەکی سروشتی لەبەرئەوەی ژن پەیوەندییەکی بەهێزی بەژیانەوە هەیە ژێری سۆزداریانەی لەپێشترە. وەک دایکی منداڵان لەمیانەی ڕەنجێکی پڕ لەئێش و ئازارەوە بەرپرسیاری سەرەکی ژیانی کۆمەڵایەتییە. بە ئەندازەی دەرککردن بە ژیان، باشتر دەزانێت کە چۆنیش بەسەر ببرێت. کۆکەرەوەی خواردەمەنییە، ئەمەش هەم ئەنجامێکی ژێری سۆزدارییە، هەم وەک پێویستییەکی ئەو وانەیە کە لە سروشت فێری بووە. یەکێک لە پێدراوە ئەنترۆپۆلۆژییەکان ئەوەیە کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئەزموون و کەڵەکەبوونی کۆمەڵگابوون لە تەوەرەی دایک ـ ژن کۆبۆتەوە، ڕۆڵی جۆرێک لە دەوڵەمەندێتی و ناوەندی بەهاکانی بینیوە. ئیتر دەتوانرێت مەزەندەی ئەوە بکرێت کە دایکی زێدە ـ بەهاکانیشە. چاوتێبڕینی ئەم بەهایانە لەلایەن پیاوە بەهێزەکەوە کە نێچیروانی بە ڕۆڵی سەرەکی خۆی زانییوە، شتێک نییە مایەی تێگەیشتن نەبێت. لە حاڵەتێکدا دەسەڵاتی خۆی ئاوابکات دەتوانێت ئەوەنتاژی مەزن بەدەست بێنێت. لە کردنی ژن بە بابەتێکی زایەندی تا دەگاتە باوکایەتیکردنی منداڵان، گەیشتن بە جۆرێک لە پێگەی خاوەندارێتی لەسەر کولتووری مەعنەوی و ماددییەکانی دیکە چەندەی بڵێی ئارەزووەکان دەوروژێنێت. ڕەوشی ڕێکخستەیی ئەو هێزەی لە نێچیروانی بەدەستی هێناوە، شانسی دەسەڵات و ئاواکردنی یەکەمین پلەداری کۆمەڵگای پێدەبەخشێت. لەم جۆرە دیاردە و گۆڕانکارییانەدا بۆ یەکەمین جار دەبینین کە ژێری ئەنالیتیکی بە ئامانجی خراپە لە بونیادی کۆمەڵگادا بەکاردەهێنرێت و بە دۆخێکی سیستەماتیک دەگات.

لە باوەڕی دایکی پیرۆزەوە پەڕینەوە بۆ باوەڕی باوک دەبێتە هۆی بە بەرداکردنی قەڵغانی پیرۆزی بۆ ژێری گریمانە (ئەنالیتیک)یی. دەشێت بەم شێوەیە ریشە داکوتانی سیستەمی باوکسالاری بە ئەگەرێکی بەهێز دابینێین. لەڕووی مێژووییەوە لەمیانەی بەڵگەی بەهێزەوە دەتوانین بسەلمێنین کە سەرهەڵدانە شکۆدارەکەی زهنییەتی باوکسالاری لەحەوزی دیجلە ـ فوراتدا بووە. لە نزیکەوە سالآنی ٥٥٠٠ ـ ٤٠٠٠ پ.زدوای سەرهەڵدانی لە میزۆپۆتامیای خواروو لە تەواوی میزۆپۆتامیا بڵاوبۆتەوە، بووە بە کولتورێکی کۆمەڵایەتی پێشەنگ. لە ڕێگای تۆمارە شوێنەوارناسییەکانەوە روون دەبێتەوە کە بەر لە پەڕینەوە بۆ ئەم کولتوورە، لە چاخەکانی میزۆلیتیک و نیولیتیکدا و بە زۆریش لە میزۆپۆتامیای سەروو و بناری چیا ـ پێدەشتەکاندا کۆمەڵگای دایکسالاری پێشەنگ بووە. لە کولتووری نووسراویشدا چەندین سەرەداوی ئەم راستییە دەبینرێت. فاکتەرە ئایینی و زمانەوانییەکانی پشت بەستوو بە ژن چەندەی بڵێی پێشکەوتووە.

دەتوانین بڵێین بۆ یەکەمین جار لە ئاستێکی جددیدا کێشە کۆمەڵایەتییەکان لە جڤاتە باوکسالارییەکان سەریهەڵدا کە لەگەڵ تێپەربوونی کاتدا لەدەوری پیاوی بەهێز بوو بە باوەڕییەک. ئەم سەرەتایەی کۆیلایەتی ژنان، لە منداڵانەوە دەستپێدەکات و زەمینەی کۆیلایەتی پیاویش ئامادە دەکات. ژن و پیاوە کۆیلەکان چەندە ئەزموونی کۆکردنەوەی بەها بەدەست بێنن لەسەرووی هەمووشیانەوە زێدە ـ بەرهەم، بەو رادەیە دەخرێنە ژێر کۆنترۆڵ و باڵادەستییەوە. چەندەی دەچێت دەسەڵات و دەسترۆیی بایەخدار دەبێت. رێککەوتنی پیاوی بەهێز + پیاوە تەمەندارە بە ئەزموونەکە+ شامان پێکەوە وەک توێژێکی خاوەن جیاکاری ناوەندێکی دەسەڵات پێکدێنن کە رووبەڕووبوونەوەی ئاستەمە. لەم ناوەندەدا بۆ بەدەستهێنانی حوکمڕانی زهنی، ژێری گریمانەیی چیرۆکێکی میتۆلۆژیانەی ئاوارتە پێشدەخات. ئەم دونیا میتۆلۆژییەی لە مێژووی کۆمەڵگای سۆمەردا دەیناسین لە دەوروبەری پیاوی ئیلاهیکراودا تا ئاستی خولقێنەری ئەرز و ئاسمان شکۆدار دەکرێت. لەکاتێکدا پیرۆزی و ئیلاهیبوونی ژن تا دەکرێت بچووکدەکرێتەوە و دەسڕێتەوە، پیاو وەکو خاوەن هێزێکی موتڵەقی باڵادەستی دەچەسپێنرێت و لەمیانەی تۆرێکی سەرسوڕهێنەری ئەفسانەوە هەموو شتێک بۆ پەیوەندی حوکمڕان ـ حوکمکراو، خولقێنەر ـ خولقێنراو دەگۆڕێت. ئەم دونیا میتۆلۆژییەی بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا دەسەپێنرێت و وایان لێدەکرێت قبووڵی بکەن دوای ئەوەی وەک گێڕانەوەیەک بەهای سەرەکی بەدەست دێنێت دەبێت بە ئایین.

پیاوی بەهێز: ئەو پیاوەیە کە خوازیارە لە مەنگەنەی دایک ـ ژن رزگاری بێت و لە میانەی پێگەی نێچیروانییەوە ئەم هێزە بەدەست دێنێت. هێزی جەستەیی و بەهرەی نێچیروانی شانسی راوی سەرکەوتووانەی زیاد دەکات. ئەو یەکینەیەی لەگەڵ ئەو لاوانەدا ئاوای دەکات کە خوازیارن سوود لە ئەزموونەکەی وەربگرن سەرکەوتنی زیاتریان بۆ فەراهەم دەکات. لەوانەیە یەکەمین ماهییەتی سەربازی مێژوو لەسەر ئەم بنەمایە سەریهەڵدا بێت. بەمجۆرە پیاو بۆ یەکەمجار لەمێژوودا بەرامبەر بە ژن زاڵ بوونێکی بەرچاوی بە دەست هێناوە. بەو رێکەوتنەی لەگەڵ تەمەندارانی تیرەدا پێشی خستووە باوکسالارێتی لە بەرامبەر دایکسالارێتی بەهێز دەکات.

دوا ئەڵقەی رێکەوتنەکە شامانە کە شیفا بەسەر کۆمەڵگادا دەبەخشێتەوە و خاوەن موعجیزەیە. ئەرک و رۆڵی هاوبەشی راهیب و سیحرباز لەخۆوە دەگرێت. کارەکەی پەروەردەیە. لەوانەیە یەکەم پسپۆڕی ناو کومەڵگا بێت. کەمێک لەگەڵ فێلبازی تێکەڵیش بێت، پسپۆری شامان بەرەبەرە لەناو کۆمەڵگادا بە دەزگا دەبێت. شامانەکانیش زیاتر پیاون. لە ئاواکردنی خانەدانێتیدا، لە میانەی رێککەوتنی هەر سێ هێز سیستەمی دایکسالاری زەبرێکی کوشندەی بەردەکەوێت. لە دەقە سۆمەرییەکاندا شوێن پەنجەی ململانێی توند و بەرفراوانی نێوانیان دەبینین. لە سایەی ئەم سیستەمەدا پیاو هەم خاوەنی منداڵەکانە، باوکیانە؛ هەم خوازیارە ببێتە خاوەن منداڵێکی زۆر ـ بە تایبەتیش کوڕ بۆ بەهێز بوونی ـ، هەم بە پاڵپشتی ئەمانە بەها کەڵەکەبووەکانی دەستی دایک ـ ژن زەوت دەکات. سیستەمی موڵکایەتی پێش دەکەوێت. لە تەنیشت موڵکی هاوبەشی دەوڵەتی راهیب، موڵکی تایبەتی خانەدانیش پەرەی سەندووە. لەم لایەنەوە باوکایەتی کردنی منداڵانیش پێویستە. واتا بۆ ئەوەی میراس بۆ منداڵان بمێنێتەوە ـ بە تایبەتی کوڕ، مافی باوکایەتی مەرجە.

هەرچەندە ئەم ململانێیە لە کۆمەڵگای سۆمەردا هاوسەنگییەکەی دژی ژن تێک بچێت، بەڵام تا ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز هاوسەنگ بەڕێوەچووە. لێکۆڵینەوەی ململانێی جیاوازی ژن ـ پیاو کە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە لەناو هەمەڕەنگییە مێژووییەکەی ئەزموون بەخشتر دەبێت. هەوڵی ئەنجامدانی دەدەین. تارادەیەکی مەزن راهیبەکان لە ڕێگای مەشروعییەت (ئیقناع و ڕازی کردن)ەوە کارەکانیان رادەپەڕێنن. گەورەترین بەهرە و داناییان لەمەدا گووتەی خوداوەند و پاوانکردنی زانستە. گووتەی خوداوەند و داهێنانە زانستییەکان هێزێکی مەزنی بەڕێوەبەرایەتییان پێدەبەخشێت. نابێت لەبیر بکەین تەنانەت لە سەرمایەداریشدا زانست هێزە. ئەوە بە بیر خۆمان بێنینەوە کە لە کۆمەڵگای نیولیتیک بە تایبەتی لە قۆناخی تەل حەلەفدا بناخەی ئەم زانستە دانراوە. کۆمەک و رۆڵی خوداوەندەکانی ژن ـ دایک لەم قۆناخەدا یەکلاکەرەوەیە. دەبێت لە تەواوی بابەتەکانی رووەک، ئاژەڵی ماڵی، گڵکاری، رستن، ئاش(دەستاڕ)، خانوو(ماڵ) و ماڵی پیرۆزدا باش لە رۆڵی دایک ـ ژن وەک یەکەمین مامۆستا تێبگەین. بانگەشەی ئینانای دایکە ـ خوداوەند لە ململانێکەیدا لەگەڵ خوداوەندی پیاو ئەنکی کە دەڵێت: "خۆم داهێنەری (١٠٤) بەها ـ ME ـ گەورەکەم، بەڵام لێم دزراوە" باش ببینرێت. واتا زۆربەی داهێنانەکان لەلایەن دایک ـ ژنەوە دۆزراوەتەوە. پیاوە بەڕێوەبەرەکان ئەمانەیان لە ژنەکان دزی. قۆناخی شارستانێتی تارادەیەک لەسەر ئەم بنەمایە بونیادنراوە.
شوێنگەی ژن و خێزان لە سیستەمی زەقورەدا چی بەسەر هات؟ پرسیارێکی گرنگە.رکابەرایەتی ئایینی دایکە ـ خوداوەند بەرامبەر ئایینی راهیبی زەقورەکان، لە دەقە سۆمەرییەکاندا زەق و بەرچاوە. ئەم ئۆپۆزسیۆنە شێوەی جیاواز بە خۆیەوە دەبینێت. راهیبە ژنەکان لەژێر سایەی خۆیاندا پەرستگا ئاوادەکەن. تەنانەت هەر شارێک خوداوەندە ژنێکی دامەزرێنەریان هەیە. نموونەی بەرچاو ماجەراکانی خوداوەندی ئوروک ئینانایە. ئوروک ـ دەشێت ناوی ئێراقی ئەمڕۆ لە "ئوروک" ەوە هاتبێت ـ وەکو یەکەمین دەوڵەتشاری سۆمەرییەکان کە جێگای خۆی لە مێژوودا گرتووە، نموونەیەکی شایستەی لێکۆڵینەوەیە. لەبەرئەوەی شاری یەکەمین پادشا ـ پیاو گلگامێشە بەناوبانگە. شیمانە دەکرێت ئوروک یەکەمین نموونەی دەوڵەتشار بێت. ساڵانی ٣٨٠٠ ـ ٣٠٠٠ پ.ز لە مێژوودا وەکو سەردەمی ئوروک باس دەکرێت. دامەزراندنی شارەکە لەلایەن ئینانای خوداوەندە ژنەوە، ئەوە پشت راست دەکاتەوە کە دێرینە و رۆڵی ژن ـ دایک تا ئەو کاتەش پێشەنگە. تێکۆشانی ئوروک بەرامبەر بە ئەریدۆ ـ کە شاری خوداوەند ئەنکییە و لەوانەیە یەکەمین دەوڵەتی راهیبی بێت ـ کراوە بە داستان. بە ئەندازەی ئەوەی لە کەسایەتی ئینانا و ئەنکیدا نموونەی بەرجەستەی ململانێی نێوان ژن ـ پیاو پیشاندەدات، لایەنە داستانییەکەشی دەخاتە روو. لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا وێنەی خوداوەندەژن کاڵ دەبێتەوە. وەکو دیارە لە قۆناخی بابلدا دووچاری دۆڕانێکی مسۆگەر دێت. بە رادەیەک دەبێتە کۆیلە کە ئیتر سۆزانییەکی فەرمی تایبەت و گشتییە.

هەر وەکو دەزانرێت لە بەشێکی زەقورەکاندا ژن وەکو ئۆبژەیەکی ئەشق رۆڵی بینیوە. بە تایبەتی رۆڵی ئۆبژەی ئەشق بۆ کچانی خێزانە باشەکان جێگای سەربەرزییە. کچە هەڵبژاردە و تایبەتەکان دەبرێنە ئەوێ. لە سیستەمی راهیبەکاندا پێشکەشکردنی ئافرەت سەرسوڕهێنەرە. لە زەقورەکاندا هاوشێوەی سیستەمی کۆشکەکان بە هەموو جۆرە پەروەردەیەکی جوانکاریدا تێپەڕ دەبن. لە هەندێک بەهرە (هونەر، مۆسیقا)دا دەبن بە پسپۆڕ. پێشکەشی ڕەزامەندی پیاوە بژاردەکانی ناوچەکانی دەوروبەر دەکرێن. کاتێک لەگەڵ هەندێکیان ڕێکدەکەون، هاوسەرگیری دەکەن. بەم شێوازە هەم داهات، هەم چالاکی پەرستگا تا بڵێی زیاد دەکات. هێنانی ژنێکی پەرستگا تەنیا بەشی پیاوانی بنەماڵە رەسەنەکانە.. هەروەها لەبەرئەوەی پەروەردەی پەرستگایان بینیوە، لەناو تیرە نوێیەکان نوێنەرایەتی چالاکی (مەراسیم) پەرستگا دەکەن و بە کۆمەڵگا ـ دەوڵەتی نوێیانەوە دەبەستنەوە. ژنان بە جۆرێک لە جۆرەکان کاراترین ـ بەرهەمدارترین سیخوڕەکانی کۆمەڵگا ـ دەوڵەتە نوێکەی راهیبن. ئەمە پەیڕەوێکە کە بە شێوەیەکی شارەزایانە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان دەوڵەتەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە ئیسرائیل بەکاری دەهێنن. بەم جۆرە بە کۆمەڵ بەکارهێنانی ژن، نموونەی سەرەتایی هونەری " ماڵی گشتی" (سۆزانیخانە ) یە. چەندەی ئافرەت دەکەوێت (دەرووخێنرێت) لە خوداوەندی ڕەسەن و ژنانی ئەشقی پەرستگاکانەوە بۆ " کرێکارە" بێ چارەکەی سۆزانیخانە دەگۆڕێت کە خۆی هەراج دەکات. لەم لایەنەشەوە کۆمەڵگای سۆمەری خاوەنی یەکەمین شەڕەف یاخود بێ شەڕەفییە. بەڵام بە بێ ئاماژەکردن بەمە تێپەڕ نابم: ئەگەر ئەم پەیڕەوە ئیستیغلال نەکرابایە و بە ئاستێکی شەڕەفمەندانە بگەیەنرایە نموونەیی دەبوو. لەو سیستەمانەی کە دایک ـ ژن نموونەکەی پێکدێنن یان ئەوانەی باوک ـ پیاو پێشەنگایەتی دەکات، گەشە کردنێکی تەندروستانەی کچان زەحمەتە. نە زانیاری، نە توانا ماددییەکان دەرفەت بەمە نادەن. گەورە کردن (بەخێوکردن)ی کچان پێویستی بە شارەزایی و ماددیات هەیە.

لەوانەیە وەکو گۆڕەپانی گونجاو بیر لە پەرستگاکانی ئافرەتان بکرایەتەوە. بەڵام کۆمەڵگای پیاو سالاری لە ڕێگای فشار و قۆستنەوەوە ئەم دەزگایە دادەڕووخێنێت. نموونەی سۆمەرییەکان لەبەرچاوە. دەزگایەک جێگای باسە کە کۆمەڵگا بێزووی پێوە دەکات و بۆ ناردنی کچەکانیان کەوتوونەتە پێشبڕکێوە. بە گوێرەی من بەو دۆخەشیەوە یەکەمین نموونەی خۆی پێشکەش دەکات کە تا ئێستاش پێی نەگەیشتوون. لەم پەرستگایانە (دەشێت بە پەیمانگاکانی ئەمڕۆی تایبەت بە کچان بچوێنرێت) کچان دەرفەتێکی گەورەی پێشکەوتن بەدەست دێنن. ئامانجە سەرەکییەکەشیان هەڵبژاردنی مێرد نییە، بەڵکو پێشەنگایەتی کردنی کۆمەڵگا ـ دەوڵەتی نوێیە. کۆمەکێکی دەست لێبەرنەدراو پێشکەش بە ژیانێکی کۆمەڵایەتی ڕەسەنتر و پڕ لە ئەشق دەکەن. لە کۆمەڵگایەکی نموونەییدا پەروەردەکردنی کچە بچووکەکان لەناو خانە و سیستەمی قوتابخانەیەکی پیرۆز و شکۆدار ناچارییە. بە تایبەتی پەروەردەی کچان لەناو خێزانی ناوک (باوان و منداڵان) و خێزانی فراوان زۆر دواکەوتووە و لە موتوربەکردنیان بە کۆیلایەتی کۆمەڵگای گشتی ـ کۆمەڵگای پیاو ـ بەولاوە هیچ ئامانجێکی دیکەی نییە. دەشێت " پەیمانگای ژنی ئازاد" ڕۆڵی پەرستگای هاوچەرخ ببینێت. لە کۆمەڵناسی ئازادیدا هەوڵی تاوتوێکردنی ئەم بابەتە دەدەم. وەک بابەتێکی یەک پارچە لەگەڵ ئەمەدا باسی خێزانیش دەکەم!

ئاشکرایە ڕێکخستنی ژنان لەلایەن زەقورەکانەوە لە چوارچێوەی خزمەتی کۆمەڵگا ـ دەوڵەتی نوێدا پێشخراوە. لە ڕاستیدا ڕاهیبەکان هەم ئەفسوونییانە بیریان کردۆتەوە، هەم کۆمەڵگا ـ دەوڵەتی نوێیان نزیک بە نموونەیی ڕێکخستووە. تواناکانی خۆراک کەلەدەوروبەری ژندا پێکهاتوون سەرەتای ئابوورییە. سروشت و ژن لەناو یەکێتیەکی تەبادان. دایکەخوداوەند دەکرێتەهێمای چەمکی ئایینی سروشتی و زیندوو. بەشی زۆری ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی ماددی داهێنانی ژنە. کولتووری خۆراک و پۆشاکیش مۆرکی ژنی پێوەیە. لەگەڵ سەرهەڵدانی شارستانیش تەواوی ئەم بەهایانەنکوڵییان لێدەکرێت و لەژێر هەژموونگەرایی پیاودا بۆ ئامرازەکانی بەدەست هێنانی قازانج و سەرکوتکردن دەگۆڕێت. خاکی دایک بێبایەخ و کەم دەبینرێت. پەرتووکەپیرۆزەکان بەپیاوان دەڵێن"ژنان کێڵگەتانن، چۆن خوازیارن وەها بیکێڵن". لەمەش مەترسیدار تر ئەوەیە، چونکەشارەکانی سۆمەر بەردەوام خاک بەئامانجی بەدەست هێنانی قازانج بەکار دێنن ڕێگا لەپێش درزبوونی خاک دەکەنەوە، بەمجۆرەش لەمیانەی بیابانبوونی دروستکراوەوەمەترسی بیابانیبوونی سروشتی ئامادەو گەورەدەکەن. ڕۆڵی شارستانی لەبیابانیبوونی میزۆبۆتامیادا زۆر بەکاریگەرە.

## ٣. هیچ کۆیلایەتیەک بە هێندەی کۆیلایەتی ژن ڕۆنەچووە و ڕەوا نەکراوە.

مۆدێلی کۆمەڵگای شارستانیی سۆمەر بەلانی کەم هێندەی مۆدێلی نیولیتیک پێشکەوتنی شارستانێتی لە جیهان دەستنیشان کردووە. وەکو زاراوە جیاوازی "شارستانێتی" لەگەڵ "کولتوور" پەیوەندی بە جیابوونەوەی چینایەتییەوە هەیە. شارستانێتی پەیوەندی بە کولتوور و دەوڵەتی چینەوە هەیە. بە دەزگا بوونی شارنشینی، بازرگانی، تیۆلۆژی و زانست، پێشکەوتنی پێکهاتەی سیاسی و سەربازی، لە جیاتی ئەخلاق دەرکەوتنە پێشی حقوق و ڕەگەزپەرستی جڤاکی پیاو نیشانە لەپێشینەکانی کۆمەڵگای شارستانی نوێیە. بە واتایەکیش دەشێت کۆی ئەم تایبەتمەندیانە بە کولتووری کۆمەڵگای شارستانی بەناو بکرێت. بەم جۆرە هەردوو زاراوە هاو ناوەڕۆک دەبن. بە هەمان واتا بەکاردەهێنرێن. قۆناخێکی پەلهاوێشتنی هاوشێوەی پەلهاوێشتنە گەورەکەی کولتووری کۆمەڵگای نیولیتیکی هیلالی بە پیت لە جیهاندا، بۆ دووەم جار دەست پێدەکات. ئەم جارە دوای ئەوەی هیلالی بە پیتی "لانکەی شارستانێتی" ڕۆڵە تازەکەی (ئێتر کچ نییە کوڕە) لە خاکەکانیدا دەهێنێتە دونیا و لە بێشکەی خۆیدا گەورەی دەکات، لەگەڵ کچە پێگەیشتووەکانی جیهاندا هاوسەرگیری پێدەکات، بەم جۆرەش بەردەوامی بە زۆربوونی خۆی دەدات. لێکچواندن لە جێگای خۆیدایە. دەشێت گریمانە بکەین کە پەلهاوێشتنی کولتووری نیولیتیک، لە میانەی گەیشتنی کچەکانی دایکە خوداوەند بە هەر گۆڕەپانێکی جیهان و پێگەیشتنیانەوە خۆی بە دەزگا کردووە. هەرچی کۆمەڵگای شارە کە گوزارشت لە کولتووری دەسەڵاتداری پیاو دەکات، بڵاوبوونەوەی بە جیهاندا بە واتای بە دەزگابوونی کوڕەکانی دێت. کوڕانی وەچەی شارستانی پیاو کچان دەکەنە ژنی

خۆیان و دەیان بەستنەوە ـ کۆمەڵگایەک کە قورساییەکەی ژنە لەناو کۆمەڵگای پیاو سالاریدا دەتوێنرێتەوە ـ دوای ئەمەش هەر کوڕیان دەبێت، بەم جۆرەش تا دەگاتە رۆژگاری ئەمڕۆمان پیاوێتی شارستانییەکەمان زیاد و بەهێزتر دەبێت، لەم چوارچێوەیەشدا بەردەوام دەبێت.

پێویستە زۆر سەرنج بدرێتە سەر تایبەتمەندییەکی کۆمەڵگای شارستانێتی کە بە دەزگابووە. دەشێت ئەم راستینەیە بە رەوشی ئامادەکراوی کۆمەڵگا بۆ دەسەڵات بە ناو بکرێت. ئەمەش هەر وەکو ئەوەیە کە: لەسەر نەریتی بە ژێتیکردنی ئافرەتان سەرلەنوێ کۆمەڵگا ئاوا بکرێتەوە. دەسەڵاتیش تا دڵنیا نەبێت کە کۆمەڵگای وەکو ژنێتی ئافرەتان ئامادە کردووە، ئەوا متمانەی بە هەبوونی خۆی نابێت. ژنێتی وەکو کۆنترین کۆیلایەتی، لە ئەنجامی ململانێیەکی درێژخایەن و بەرفراوانی پیاوی بەهێز و دەست و پێوەندەکەی لەگەڵ دایک ـ ژن و تەواوی باوەڕیەکەیدا و لە دوا جار لەمیانەی شکست هێنانی ژن و بالادەستبوونی کۆمەڵگای رەگەزپەرستی پیاوەوە بە دەزگا بووە. ئەم کردارەی بالادەستی لەوانەیە بەر لە گەشە کردنی شارستانێتی جێگای خۆی لەناو کۆمەڵگادا کردبێتەوە. ئەمە تێکۆشانێکی هێندە دژوار و بەرفراوانە کە لەگەڵ ئەنجامەکانیدا لە بیرەوەرییەکاندا سڕاوەتەوە. ئافرەت ئەوەی نایەتەوە یاد کەچی، لە کوێ و چۆن لەدەستداوە. ژنێتییەکی دەستەمۆ و ملکەچ بە دۆخێکی سروشتی لەقەڵەم دەدات. لەم سۆنگەیەوە هیچ کۆیلایەتییەک هێندەی کۆیلایەتی ژن هەرس نەکراوە و مەشروعییەتی پێنەدراوە.

ئەم پێکهاتەیە دوو جۆر کاریگەری وێرانکاریانەی لەسەر کۆمەڵگا هەبووە: یەکەمیان کردنەوەی کۆمەڵگا بە رووی کۆیلایەتیدا، دووەمیان؛ بەرێوەبردنی تەواوی کۆیلە (کۆیلایەتییە)کان لەسەر بنەمای کردنیان بە ژن. هەر وەکو مەزەندە دەکرێت ژنێتی تەنیا ئۆبژەیەکی رووتی زایەندی نییە و تایبەتمەندییەکی بایۆلۆژیانە نایەنێتەوە یاد، بەڵکو ژنێتی لە ناوەرۆکدا تایبەتمەندییەکی کۆمەڵایەتییە. کۆیلایەتی، ملکەچی کردن، پەسەند کردنی جنێو، راهاتن لەگەڵ گریان و درۆزنی، نەبوونی بانگەشە، خۆ پێشکەش کردن و..هتد و تەواوی ئەو رەفتار و راوەستانەی ئەخلاقی ئازادی پەسەندیان ناکات بە پیشەی ژن لەقەڵەم دەدرێت. لەم لایەنەوە زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی رووخێنراوە. بۆیە زەمینەی راستەقینەی کۆیلایەتییە. کۆنترین زەمینەی دەزگاییە کە تەواوی کۆیلایەتی و بێ ئەخلاقییەکان لەسەری دەست بەکار دەبن. کۆمەڵگای شارستانێتی پەیوەندی بە رەنگدانەوەی ئەم زەمینەوە هەیە لە تەواوی بەشەکانی کۆمەڵگادا. بە ژنێتیکردنی تەواوی کۆمەڵگا بۆ بەرێوەچوونی سیستەم پێویستە. دەسەڵات و پیاوێتی یەک ناوەرۆکیان هەیە. لە حاڵەتێکی وەهادا ژنێتی کۆمەڵگا پێویستییەکی ـ بۆ سیستەم و دەسەڵات ـ دەست لێبەرنەدراوە. چونکە دەسەڵات پرەنسیپی ئازادی و یەکسانی ناناسێت. لە رەوشێکی پێچەوانەدا دەسەڵات بوونی نابێت. لێکچوونی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگای رەگەزپەرست (رەگەزگەرایی) لە ناوەرۆکدایە.

یۆنانییەکان کە بە یەکێک لە قۆناخە گەورەکانی شارستانێتی دادەنرێن بە شێوەیەکی فەرمی کوڕە لاوەکانیان وەک "هاوجووت "ێک پێشکەش بە پیاوێکی خاوەن ئەزموون دەکرد. بۆماوەیەکی درێژخایەن هۆکارەکەیم بۆ شینەدەکرایەوە. فەیلەسوفێکی وەکو سوقراتیش دەڵێت:" ئەوەی گرنگە بەردەوام بەکارهێنانی ئەم کوڕە نییە، بەڵکو پەروەردە کردنێتی لەلایەن گەورەکەیەوە". لێرەدا لۆژیک و مەبەست لە بەکارهێنانی بەردەوامی لاوان وەک هاوجووتێک زیاتر ئامادەکردنێتی بۆ تایبەتمەندییە ژنانییەکان. بە شێوەیەکی روونتر شارستانێتی یۆنانیش خوازیاری کۆمەڵگایەکی بە ژنکراوە. چەندە لاوانی رەسەن و بە رەچەڵەک هەبن، ئەم کۆمەڵگایە (بەژنکراوە) پێک نایەت. بۆ پێکهێنانی ئەم کۆمەڵگایە پێویستە تایبەتمەندییە ژنانییەکان هەرس بکەن. لە تەواوی کۆمەڵگاکانی شارستانێتی مەیلی هاوشێوە هەن. نێربازی لەم کۆمەڵگایەدا زۆر بەربڵاوبووە. حاڵەتێکی وەهای بەخۆوە گرتووە، وەکو نەریتێک هەر گەورەیەک کوڕە لاوێکی تایبەت بە خۆی هەبووە. لەوە زیاتر کە نێربازی وەکو لادان و نەخۆشییەکی زایەندی تاکەکان ببینرێت، گرنگ ئەوەیە وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ببینرێت، کە کۆمەڵگای چینایەتی، کۆمەڵگای دەسەڵات رێگای لە پێش کردۆتەوە. لە کۆمەڵگاکانی شارستانیدا زایەند و دەسەڵات نەخۆشی کۆمەڵایەتین، وەکو شێرپەنجە وان. هەر وەکو چۆن بەبێ یەکتر نابن، یەکتریش زیاد دەکەن: هەر وەکو زیادبوونی خانەکانی شێرپەنجە. پەیوەندی نێوان شێرپەنجەی تاک و شێرپەنجەی کۆمەڵگا لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا بە شێوەیەکی بەرفراوانتر شرۆڤە دەکەین.

دەمەوێت بگەمە ئەم خاڵە: هەزاران ساڵە لە کۆمەڵگاکانی شارستانیدا زەمینەی دەسەڵات بە شێوەیەکی تایبەت و لە جۆری ئامادەکردنی بووک بۆ زاوا ئامادە کراوە. نەریتی شارستانێتی ژن وەکو "کێڵگەی پیاو" دەبینێت. نەریتێکی هاوشێوە لەناو کۆمەڵگاش جێگای باسە. دەبێت پیاو وەکو ژنێک خۆی پێشکەش بە دەسەڵات بکات. ئەوانەی یاخی دەبن و خۆ پێشکەش کردن پەسەند ناکەن، لە ڕێگای شەڕەوە هەوڵی ئامادە کردنیان دەدرێت. بەگوێرەی تێڕوانینی خوداوەندی چەرخی ناوین ژن بووونەوەرێکی ناتەواوە. بۆ پاشکۆ و ئەندامێکی زۆر بێکاریگەری پیاو داخراوەتە نزمترین ئاست. کۆیلایەتی ڕەگەزی گەیشتۆتە بێ واتاترین شێوەکانی خۆی. بەشێوەیەکی بێ سنوور ژن دیاریەکە پێشکەش بە پیاو کراوە. لەجیاتی مرۆڤ، وەکو موڵکێک هێندەی بخوازرێت دەکردرێت، دەفرۆشرێ، بەکاردەهێنرێ. تەواوی ئایینەکانی دیکەی چەرخی ناوین لەگەڵ یەکتر لەنێو پێشبڕکێ دان بۆئەوەی ئەم پیلانگێڕییە لەسەر مرۆڤایەتی پەیڕەو بکەن. بە ڕەوشێکی وەها گەیشتوون کە دەڵێن: خۆزگە و هەزار ڕەحمەت لەچەرخی یەکەم. لە مەسیحیەتدا ئەنگیزاسیۆن، لە ئیسلامیشدا داخستنی دەرگای ئیجتهاد (ڕجتهاد)، بەرفراوانترین تیرۆرە لەسەر پێکهاتەی زهنی مرۆڤ. لەلایەکی دیکە پیلانگێڕی کۆشک لە گەشەدارترین سەردەمی خۆی دابوو. باوەڕی پەرستگا لە کۆشکەکان لە ڕێگای پیلانگێڕییەوە ئەنجامگیر دەبێت. هەردووکیان یەکتری دەخوڵقێنن و دێننە ئاراوە.

وەکو ڕەنگدانەوەیەکی جیابوونەوەی چینایەتی کۆمەڵگا، دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت و مەحکوم کردنیان بە خزمەتکاری، ڕێکی ئەم قۆناخە هاتووە. جیاوازیەکی مەزن لەنێوان مرۆڤەکان دروست دەبێ؛ لەکاتێکدا خوداوەندەکانی سۆمەردەبن بە خولقێنەر، سەرلەنوێ بەندەکانی خۆیان وەکو خزمەتکار دەخولقێنن. کێشمەکێش و خوڵقاندنی ئەنکی و نین هورساک ـ ئینانا لە میتۆلۆژیەکاندا لە کاتێکدا گوزارشت لە بەجێهێشتنی ڕۆڵی خولقێنەرانەی ڕابردووی ژن بۆ پلەی دووەم دەکات و لەبەر چاوانی دەخات، لەلایەکی دیکەوە سەمبۆڵی شێوەی مرۆڤی کۆیلە و خزمەتکارە. ئەو تابلۆیەی ڕاهیبە سۆمەریەکان کێشاویانە لە تەواوی دووالیزمی خودا ـ بەندە سیستەمەکانی دواتردا ڕۆڵ دەبینێ. لەگەڵ ئەوەی دەستنیشان کردنی ئەم بابەتە زۆر گرنگە، ئەوا دوورکەوتنەوەی پەرتووکە ئایینەکان و تەنانەت ڕەتکردنەوەیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەبێ لەپێناو بەرژەوەندیەکانیان ڕووی ڕاستەقینەیان شاراوە و دەمامک کراو بێت. ئەو ناسنامە خوداییانەی لە کۆمەڵگای سۆمەریەکاندا تەسەور کراوە، وەکو ڕەنگدانەوەیەکی جێگیر بوون و پێگەگرتنی هێزەکانی سروشت و کۆمەڵگایە. لەگەڵ بواری خۆرسکیدا، لایەنەکانی کۆمەڵگا دەردەکەوێتە پێش، پێبەپێ قورسایی و پایەی ژن کەم دەبێتەوە، پێشکەوتنی سەرنج ڕاکێش لە جیابوونەوەی مرۆڤی بەندە و خزمەتکار دەبینرێت. لە کاتێکدا زیاد بوونی هێزی سیاسیانەی کۆمەڵگا دەبێتە هۆکاری ئەوەی بە شێکی خواوەندەکان بەرز بنەوە و دەرکەونە پێش، هەندێ ناسنامەش وون دەبن و لە شێوەدا دووچاری گۆرانکاریەکی مەزن دێن. لە قۆناخی بابلدا هێزی ڕەهای مۆنارشییەت لە بەرزبوونەوەی خواوەند مەردۆک ڕەنگ دەداتەوە. قۆناخی دواتری میتۆلۆژیای سۆمەر ئەوە نیشان دەدات کە ئیتر گەیشتونەتە بەر دەروازەی لە دایکبوونی ئایینە تاکخوداییەکان.

کاتێک تیرە بەڕەچەڵەک سامیەکانی بیابانەکان، کە بەهێز بوون، نە ژیانی باوکسالاری و (مۆنۆلۆک) چۆنیەکەکەی خۆیان لەگەڵ شارستانیەتی سۆمەردەکەن بە یەک، خوداوەندەکانی میتۆلۆژیا لە نێو شەڕدان. لە کاتێکدا کاریگەری ژن و شارستانیەتی سۆمەرنامێنێ و دەسڕدرێتەوە و داب و نەریتی باوکسالاری تیرەکانی بیابان دەبێت بە هێزێکی سیاسی، ئیدی ئاراستەی خۆی بەرەو سەرەڕۆیی و مۆنارشێتی دەگرێت. داب و نەریتی تیرەکانی بیابان لە کەسایەتی حامورابیدا بە شێوەی "من یاسام" بناخەی چەمکی پادشایەتی پێکدێنێت. لەهەمانکاتدا قووڵبوونەوە و چڕبوونەوەی ناکۆکی نێوان تیرەکان و ناو خودی تیرە، بە شێوەی داب و نەریتی پێغەمبەر ئیبراهیم بەرامبەر بە هێزی ناوەندی سیاسی کە خۆی وەکو خودا دەبینێ، هێزێکی رکابەر دێنێتە ئاراوە. پێغەمبەرایەتی ڕێگا لەپێش دابڕانێکی ڕیشەیی لە چەمکی ئایینی سۆمەریەکان دەکاتەوە. بەرامبەر بە قۆناخی خوداوەندەکانی کە لە شێوە و ڕووخساری مرۆڤدان، چەمکێکی مرۆڤایەتی لەجۆری"هیچ کاتێک مرۆڤ نابێت بە خوداوەند" جێگای دەگرێتەوە.

لەم قۆناخەشدا بە تایبەتیش بە گوێرەی داب و نەریتی سامیەکان توندی یاساکانی کۆمەڵگای باوکسالاری پشت ئەستوور بە پیاو، لە نزیکەوە پەیوەندی خۆی بەوە هەیە کە لە گەوهەری خۆیدا لەگەڵ یاساکانی دایکسالاری و کولتووری عەشتاری

خوداوەندی کشتوکاڵ و سەردەمی نیۆلیتیک ناکۆکە و لە قۆناخی بابلیەکاندا کولتووری خوداوەندی ژنی سۆمەریەکان بەلاوە نراوە. ئیتر لەم قۆناخە بەدواوە خوداوەندە ـ ژنی رابردوو، ئیتر لە ماڵی خۆیدا ژنێکی گوێڕایەڵە و بە ناموسە. ئەمە لەولاوە بمێنێت کە لەگەڵ خوداوەندەکاندا یەکسان نییە، کەوتۆتە نێو رەوشێک ناتوانێ دەنگ هەڵبڕێ و پێچەکەی لابدات. لەبەرەوەپێچەی لێ دەئاڵێنرێ، وەکو موڵکی تایبەتی پیاوی بەهێز وایە و لە ژووری تایبەتدا بەند دەکرێت. لە داب و نەریتی ئیبراهیم دا موسا ئەمە زیاتر بەرەو پێش دەبات. ئاستی بەرز و کاریگەری قووڵی کۆیلایەتی ژن لە عەرەبستان، گرێدراوی ئەو پێشکەوتنە مێژووییەیە. مەریەمی دایکی عیسا بە گوێرەی کۆنترین شێوەی داب و نەریتەکان خوداوەندە. بەڵام بەردەوام لە دەستدانی پایە و ستاتۆی ژن، لەسەردەمی لە دایکبوونی عیسادا بە تەواوی کەوتووە و بووە بە ئامرازێکی زاوزێ (زایین). لە ئاستی گشتیشدا بەمجۆرەیە. لە ماوەی نێوان ٢٠٠٠ پ.ز تا ٢٠٠٠ زایینی بەرامبەر بە شکانەوەی دەسەڵاتی سیاسی بە لای پیاو پێشکەوتنی لەمیانەی چەوسانەوە و زەبر و تەڵەکەبازیەوە، مێژووی ژن مێژووی ژێرترین (نزمترین) چینە. بە گوێرەی کۆیلایەتی پیاو، بە هۆی تایبەتمەندێتی رەگەزیەوە ژن دووچار و مەحکومی کۆیلایەتیەکی زۆر سەختتر هاتووە. لە قۆناخی بابلدا خوداوەند تیامات لە یەک ئاست و رووبەڕوو لە شەڕدایە، تەنانەت لە سەردەمی موساشدا شەڕێکی دژواری لەگەڵ ماریامی خزمی لە ئارادایە. بە سانایی ملکەچی بۆ موسا نەکردووە.

گەرچی مەریەمی دایکی عیسا هیچ کاریگەری و رۆڵێکی نییە. خودا (رەب) فووی تێکردووە ئەویش منداڵی بووە. ئەمەش واتای باڵادەستی رەهای پیاوە. فوو کردن گوزارە لە زاڵ بوون دەکات. ئەوە دەکات بە رەمز کە جگە لە باوەش کردن و بەخێو کردنی منداڵ هیچ رۆڵێکی دیکەی نەماوە. خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە لەمیانەی ناوبردنی ئەم فووکردنە بە رۆح ئەل قودس (رۆحی پیرۆز)، هەوڵدەدرێت ئەو هێزە خوداییەی کە لە ژندا نوێنەرایەتی دەکرێت چەواشە بکرێت، لە کەسێتی مەریەم ئەم هێزە دەدزرێ. ئەوەی لە سۆمەریەکاندا لەگەڵ ئەمەدا کۆکە، خوداوەندی دایکە. لە راستیدا ئەم بابەتە گرنگیەکی مەزنی ئایدیۆلۆژی هەیە. ئەم ناسنامە ئایدیۆلۆژیە رۆڵێکی دیاریکراوی لەوەدا هەیە لە قۆناخی دەرەبەگایەتیدا کاریگەری و رۆڵی زیاتر لە دەست بدات و ژن بسڕدرێتەوە. لەو رۆژە بە دواوە مەریەمەکان (ژنان) بەردەوام پاسیف و بێ کاریگەرن، بە بێ دەنگی بەسەر منداڵەکانیاندا دەگرین، بە تەواوی بە پیاوەوە گرێدراون، هەروەکو بەندکراوێکی ئەبەدی وان. هەروەکو چۆن ئەم رەوشە هیچ پەیوەندیەکی بە سروشتی ژنەوە نییە، ئەوا پەیوەندی لەگەڵ باڵادەستی مەزنی سیاسی پیاودا مسۆگەرە. هەروەکو چۆن لە قۆناخێکدا سەردەمی خوداوەندە ژنەکان زاڵ و باو بوو، لە قۆناخی دەوڵەت و کۆمەڵگای چینایەتیشدا قۆناخی خوداوەندە پیاوەکان زاڵ و باوە. ئەم راستینەیەی کە لە قووڵایی مێژوو لەناو تاریکاییدا بە جێ هێڵدراوە و لەلایەنی پیاوەوە لەمیانەی چەمکی دووڕوویی ناموس ـ ماڵ دەمامک و پەردەپۆش کراوە، بەڵام ئەمە لەمیانەی ئاستی ئازادی کۆمەڵگا کە لە ئەنجامی تێکۆشانی ئازادیەوە دەخوڵقێندرێ، ئاشکرا و واتادار دەبێت.

لەژێر کاریگەری هەلومەرجی ئەو قۆناخەی بە پوختی ئاماژەمان پێکرد کەسایەتی حەزرەتی محەمەد پێشکەوتنێکی پڕ لە ناکۆکی بە خۆیەوە دەبینێ. کولتووری هەر سێ ئیمپراتۆریەتی بڵاوبوونەتەوە، زۆر لە کولتووری تیرە عەرەبەکان پێشکەوتووترە. کەلێن و جیاوازیەکی یەکجار مەزنیان لە نێواندا هەیە. تەوتەمی تیرەکانی لە شێوەی پەنتائۆن لە کەعبە کۆبوونەتەوە تایبەتمەندێتی هێزبەخشینیان نەماوە. هەرچەندە چەندێکی لە جۆری لات، مەنات، عوززا وەکو گەورەترینیان رێزیان لێدەگیردرێ و نوێنەرایەتی تیرە بە شان و شکۆکان دەکات، وەلێ زۆر لەوە دوورن ئیلهام بەخشی شارستانیەتێکی نوێ بن، بە پێچەوانەوە بەهۆی ئەوانەوە پێبەپێ، هزرە نوێ و تەریقەتە سۆفیگەرییەکان قەدەخە دەکرێن. ئەو هزر و دەزگایانە بەسەر پێکهاتەکانی سەرخاندا زاڵن کە موحافەزەکارێتی تیرەگەرێتی بە بنەما دەگرن. هەر کەس لەمیانەی تیرەکەیەوە پەسنی دەدرێت و باسی دەکرێت. ژنان بە نەزان و بچووک دەبینرێن، کیژۆڵەکان زیندە بە چاڵ دەکرێن و رووبەڕووی مردن بەجێ دەهێڵدرێن.

کاروانە بازرگانیەکانی نێوان مەککە ـ شام گرنگی و رۆڵێکی مەزنی هەیە لە پێگەیشتنی هزری حەزرەتی محەمەد. هەروەکو دەزانرێ بە زۆری گوێڕایەڵی راهیبە نەستۆریەکانی کردووە و گفتوگۆی لەگەڵدا کردوون. باوەڕی پێهێنان و متمانەکردنی خەدیجە و خۆشەویستی و مێرد پێکردنی گرنگی و رۆڵێکی دیاریکراوی هەیە لەوەی سەبارەت بە ژن بگات بە هزر و بۆچوونێکی باش.

ئەگەر خەدیجە نەبێت ناشێ محەمەد ببێت بە پێغەمبەر. ئەگەر بە شێوەیەکی شاراوە و دەمامک کراویش بێت، بە گوێرەی مەریەم خاوەنی کاریگەریەکی زۆر مەزنترە و لە رەوشێکی وەها دایە کە نوێنەرایەتی کولتووری خوداوەندی ژن دەکات. بەهۆی باڵادەستی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پیاوسالارییە، کە لە مێژووی ئیسلامیەتدا بە شێوەیەکی پێویست و شایستە باس لە رۆڵی خەدیجە نەکراوە. ئەمە ئاشکرایە یەکەمین کەسی لە مەککە پشتگیری لە حەزرەتی محەمەد کرد خەدیجە بوو. بە تەمەنیش لە محەمەد گەورەتر و تا رادەیەک بەهێز و دەوڵەمەندە دەتوانێ ببێ بە خاوەنی کاروانە بازرگانیەکان. بێگومان ئەم رەوشەی خەدیجە لەناوکۆمەڵگای مەککەی پیاو سالاریدا وەکو ناکۆکییەکی جددی و مەزن وایە، چونکە ژن بە گێل و نەزان و بچووک دەبینن و کیژۆڵەکان بە زیندوویی زیندە بە چاڵ دەکەن. بە گوێرەی ئەوەی بە تەنیا ناتوانێ بەرگە و بەرەنگاری ئەم کۆمەڵگا هۆڤە بێتەوە، ئەوا پەیوەندیەکانی لەگەڵ محەمەد و مێرد پێ کردنی زۆر واتادارە. لە خۆشەویستی بەولاوە بەرامبەر بە کۆمەڵگای فەرمی مەککە وەکو یەکەمین چەکەرەی تۆوی سیاسی و ئایدیۆلۆژی وایە. تا وەکو مردنی نەهێنان و نەخواستنی ژنێکی دیکە لەلایەن محەمەد، جگە لە رێز گرتن، گرێدراوی هێزی ماددی و مەعنەوی خەدیجەیە. وەکو یەکەمین کەسی کە پێغەمبەرایەتی محەمەد پەسند کردووە، رۆڵی لەم پێکهاتنەدا ئاشکرایە و بەرچاوە.

دواتر ئەوانەی بۆ یەکەمین جار وەکو یەکەمین کەس باوەڕی بە حەزرەتی محەمەد دێنن ئامۆزاکەی، حەزرەتی عەلی یە کە هێشتا منداڵە و کۆیلەکەیەتی (زەید). ئەم تابلۆیە بە شێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا ناوەڕۆکی شۆڕشگێڕێتی ئەم گروپە نیشاندەدات. لە کاتێکدا لە کەسایەتی عەلی دا پەیوەندیەکانی تیرەگەرێتی بە شێوازێکی شۆڕشگێڕێتی پارچە دەکات، لە کەسایەتی زەیدیشدا کۆیلایەتی دەبەخشێ و لەمیانەی شۆڕشەوە کۆتایی پێدێنێت. لە راستیدا لەم سێیانیەدا هەرچەندە بە شێوەیەکی سەرەتاییش بێت سێ شۆڕش ئەنجام دەدرێت. لەمیانەی پەیوەندی لەگەڵ خەدیجە شۆڕشی ژن، لە رێگای پەیوەندی عەلی شەوە شۆڕشی تیرە و لە رێگای زەیدەوە شۆڕش بەرامبەر کۆیلایەتی ئەنجام دەدرێت. هەر لەبەر ئەوەی ژیانێکی هاوبەش و کۆمەڵکاریان ئاواکردووە، شێوازێکی شۆڕشگێری بەسەر ژیانیاندا زاڵە. لەسەر ئەم بنەمایە مەزنبوونی گروپ مانیفێستۆی ئایدۆلۆژی دەکات بە ناچارییەک. بەرلەوەی محەمەد ببێت بە پێغەمبەر ماوەیەکی درێژ مانەوە و هاتوچۆی بۆ ئەشکەوتی (حەرا) قۆناخی قووڵبونەوەی ئایدیۆلۆژیە. لە تەواوی قەڵەمبازەکانی پێغەمبەرایەتیدا قۆناخی هاوشێوەی ئەمە تێپەڕبووە. لە تەوراتدا بە درێژایی باس لە ئەم قۆناخەی حەزرەتی موسا دەکرێت کە لە چیاکانی سینا بە سەری بردووە.

سەرەڕای ئەم هەنگاوە مێژووییانە، ئەو مرۆڤەی کە لەمیانەی پەیوەندییەکانی کۆیلایەتی و خاکەوە بچووک کراوەتەوە و نزم کراوە، زۆر لەوە دوورە ببێتە خاوەنی بایەخێکی ناوەندی. ژنیش لە رەوشێکدایە بە چارەنووسی خۆی رازی کراوە، مەحکوومی ناسنامەیەک بووە کە خزمی شەیتانە، ناتەواوە، بێ ئەقڵە و بەردەوام بانگێشتی تاوان دەکات. لە کاتێکدا کەمێک مرۆڤایەتی پێشدەخرێت، ئەو هێشتا بە مرۆڤ دانانرێت. هەرچی چینی باڵادەست و چەوسێنەرە، لەمیانەی خەسڵەت و تایبەتمەندێتیە خوداییەکانەوە خۆی نیشان دەدات و وەکو بوونەوەرێکی لە رەچەڵەکی مرۆڤ جیاوازتر پێناسە دەکرێت؛ وەکو گرنگترین کار ناسنامەی ئایدیۆلۆژی بە گوێرەی ئەوە پێشدەخرێت. ئەو راستینە و چارەنووسەی شارستانیەتەکانی کۆن شایستەی مرۆڤایەتییان دەبینی، هێڵە گشتییەکەیان بەمجۆرەیە.

### ٤. کێشەی ژن هێندە گشتگیرە کە لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا جێی نابێتەوە.

ژن وەکو کۆنترین و خوارترین چین، فشار و چەوسانەوەیەکی بێ سنووری لەسەر پیادە دەکرێت. کێشەی ژن کە تازە بە تازە رێگای لەپێش دەکرێتەوە، بابەتێکی هێندە گشتگیر و بەرفراوانە لە چوارچێوەی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا جێگای نابێتەوە. ئازادی ژن وەکو پێوانەی گشتی تەواوی ئازادییەکان، هێشتا ئامادەکاری هەنگاونانی یەکەم دەکات. دەربازبوون لە چاخی ژنەوە (دایکسالاری) بۆ چاخی پیاو (باوکسالاری)، رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە زیانی مەزن بە ژن بکەوێت. مێژووی ٥٠٠٠ ساڵەی

**کۆمەڵگای چینایەتی بۆتە هۆی ئەوەی بە رادەی هەرە زێدە ژن زیان ببینێ و بدۆڕێنێ. فشاری هەمە لایەنە و سووکایەتی پێکردن، جیاوازی رەگەزی و هەموو جۆرێکی چەوسانەوە، شایستەی ژن بینراوە. ئەو ژنەی کە سووتاوە و سووتێنراوە، تازە بە تازە لە ژێر خۆڵەمێشەوە دەردەهێنرێت و هەوڵی پاک کردنەوەی دەدرێ. لە کاتێکدا پێویست بوو بەر لە هەموو شتێک و بە بێ هیچ مەرجێک دان بە تەواوی مافەکانی تاکە کەسی ژندا بنرێت، بەڵام لەدوای هەموو مەسەلەکان و بە شێوەیەکی سنووردار کردنی بە رۆژەڤ، پەیوەندی بە رەهەندە مێژوویی و قووڵەکانی ستەمکارییەوە هەیە. بابەتەکە هێندە بەرفراوان و گشتگیرە دەشێ ببێتە لقێکی زانستی کۆمەڵناسی، هێندە گرنگە بە شێوەیەکی سەربەخۆ و بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژ و نەخشە بۆ کێشراو و رێکخراوەیی پێویستی بە تێکۆشانێکی سیاسی دیموکراسییانە و یاسایی درێژخایەن هەیە. هەم لەلایەنی گەوهەر هەم شێوە لە تێکۆشانی نەتەوەیی و چینایەتی جیاوازترە و تێکۆشانێکی ژیانییە.**

**لێتوێژینەوە بایۆلۆژییەکان رۆڵی ژن وەک رەگ و ریشەی جۆری مرۆڤ روووندەکاتەوە. ئەوەی لەقەدی سەرەکی دابڕاوە ژن نییە، بەڵکو پیاوە. سۆزدارێتی ژن، هۆکارەکەی بۆ لانەدانی زێدەرۆییانەی لەدیالیکتیکی پێکهاتەی گەردوون دەگەڕێتەوە. بەتایبەتی لە سەردەمی شارستانیدا هێشتنەوەی ژن لە پێگەی هەرە خوارەوەدا کاریگەری لە گواستنەوەی ئەم پێکهاتەیەی بۆ رۆژگاری ئەمڕۆمان هەیە. پیاو بەردەوام خوازیارە لەلایەنی ئەقڵەوە، ئەقڵی پڕ لە سۆزی ژن بە "ناتەواو" پیشانبدات، بەتایبەت ئەمەش وەک کارەکتەری ژن بخاتەڕوو. ئەقڵی پیاو چەندین کێوماڵی گەورەی لەسەر ژن بەڕێوەبردووە، تائێستاش بەڕێوەی دەبات.**

**یەکەمیان، کردوویەتی بەیەکەم کۆیلەی ماڵ. ئەم قۆناخە پڕە لە تۆقاندن، فشار، لاقەکردن، سووکایەتی پێکردن و کۆمەڵکوژیی ترسناک. ئەو رۆڵەی بۆی دیاریکراوە و دانی پێنراوە، بەو رادەیەی سیستەمی موڵکداری پێویستی پێیە "وەچە" بخاتەوە. ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتی تا رادەیەکی زۆر گرێدراوی ئەم وەچەیەیە. لەناو ئەم ستاتۆیەدا ژن موڵکێکی رەهایە. تاڕادەیەک موڵک و نامووسی خاوەنەکەیەتی، کە ناتوانێت رووی خۆی پیشانی کەسی دیکە بدات.**

**دووەمیان، ئامرازی زایەندی (سێکس) یە. لە تەواوی سروشتدا زایەند پەیوەندی بە زۆربوونەوە هەیە. ئامانجی بەردەوامکردنی ژیانە. بەڵام بەتایبەتی لەگەڵ بەندکردنی ژن و بە زۆریش لەسەردەمی شارستانیدا، رەگەزی نێرینە جۆری مرۆڤ رۆڵی سەرەکی بەسێکس داوە، تەقینەوەی ئارەزووی زایەندی و پەرەسەندنە شێوێندراوەکەی بەخۆوە دیوە. ماوەکانی جووتبوون کە لەئاژەڵاندا زۆر سنوردارە (زیاتر ساڵانەیە)، لای مرۆڤی نێر کەمێک ماوە ئەم ماوەیە ببێتە (رۆژانە) بیست و چوار کاتژمێر. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ژن ئەو ئامرازەیە کە بەردەوام زایەند، ئارەزووی زایەندی و دەسەڵاتی لەسەر تاقی دەکرێتەوە. ئیتر جیاوازییەکانی نێوان ماڵی گشتی ـ ماڵی تایبەت هیچ واتایەکی نەماوە. چونکە هەرشوێنێک ماڵی گشتییە ـ ماڵی تایبەتە، هەر ژنێکیش موڵکی گشتی ـ تایبەتە.**

**سێیەمیان، کراوە بە رەنجدەرێکی بێ کرێ و بێ بەرامبەر. ئەنجامدانی قورسترین کاری بەسەردا دەسەپێنرێت. خەڵاتەکەشی؛ ناچارکردنێتی تاوەکو تۆزێکی تریش بچێتە سەر "ناتەواو"ییەکەیەوە. هێندە سووکایەتی پێکراوە، ئەوەی پەسەندکردووە کە بەبەراورد لەگەڵ پیاو زۆر ناتەواوە، بەهەرچوار پەلییەوە خۆی لە دەستی پیاو و باڵادەستییەکەی دەپێچێت.**

**چوارەمیان، کراوە بە ناسکترین کاڵا. مارکس پارە بە" شاژنی کاڵاکان" دادەنێت. لە راستیدا ئەم رۆڵە زیاتر لە ژندا دەبینرێت. شاژنی راستەقینەی کاڵاکان ژنە. هیچ پەیوەندییەک نییە کە ژنی تێدا پێشکەش نەکرێت. هەروەها هیچ گۆڕەپانێکیش نییە ژنی تێدا بەکارنەهێنرابێت. ئەویش بەجیاوازیەکەیەوە، هەرچەندە هەر کاڵایەک بەرامبەرێکی پەسەندکراوی هەیە، سەبارەت بە ژنیش ئەم بەرامبەرە لە بێ ئابڕوویی " ئەشق"ەوە بیگرە تا دەگاتە درۆودەلەسەی " رەنجی دایکان بەرامبەرەکەی نادرێت" بریتییە لە بێ رێزییەکی مەزن.**

هەڵبەتە بەندایەتی ـ کۆیلایەتی وەک رژێمێکی وابەستە سەپێنراوە و پەسەندکراوە. هەرچی کۆیلایەتی ژنە کە رەگەکانی بۆ کۆن بۆ سەردەمی پلەداری سەرەتایی درێژدەبێتەوە بووە بە بەرفراوانترین بابەتی ژیان. هەروەک بڵێی تۆڵە لە کۆمەڵگای نیولیتیکی دایکانە و دایکی پیرۆز دەکاتەوە، سیستەمەکانی خوداوەندە پیاوە باڵادەستەکان ئاواکراوە. لەکاتێکدا لەبەرەوەخوداوەندێتی ژن شوێنپەنجەی خۆی وندەکات، سەردەمی باڵادەستییە سەرسوڕهێنەرەکەی خوداوەندە پیاوەکان دەستی پێکراوە. هەر لەو قۆناخەوە ژن هەم لەتەواوی پەرستگا، هەم لەماڵە گشتییە ئاساییەکاندا ناچاری سۆزانێتی کراوە، بەندکراوەو کرِدراوە.

چەندەی کراوە رەوشی دیلێتی ژن قووڵکراوەتەوە. ژن تەنیا بەوە ئەرکدارکراوە لەماڵەوە منداڵ زیاد بکات و وەک قورستترین کۆیلە خزمەت بەپیاو بکات؛ بەشداریکردنی لە سیاسەت، وەرزش، زانست و بەڕێوەبەرایەتی قەدەخەیە. بۆ تەواوی کارە قورسەکانی بەرهەمهێنان بەکارهێنراوە. ئەفلاتوون لەو بۆچوونەدایە کە ژیان لەگەڵ ژن رەسەنایەتی پیاو تێکدەدات. لەبەرئەم هۆکارەشە هۆمۆسێکسی بڵاوبۆتەوە. لەدەرەوەی ژنیش، کۆیلایەتی وەک هەرەسی بەفر گەورەبووە. بۆیەکەمین جار ژمارەیەکی زۆری کۆیلەی بێکار بەکۆمەڵ سەرهەڵدەدەن. دەزگای سەربازی بەپارە داهێنراوە. نەک تەنیا موڵک، بەڵکو کۆیلەش بۆ هەر لایەک هەناردە دەکرێت. لەبەرامبەر ئەمەشدا مشەخۆرترین چینی کۆیلەدار دروستکراوە و، بەم جۆرە زاراوەی ئەرستۆکراسی بەدەست هێنراوە. گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی پڕ لەفاکتەری مشەخۆری بووە. توێژە هەرە نزیکەکان بەچینی بۆرژوازی، بەرهەمی شارستانی گریکە. بەکورتی هەروەکو چۆن کێشەکانی گۆڕەپانی کۆمەڵایەتی کێشەی نوێتری هاتۆتەسەر، کێشە کۆنەکانیش قورستربوون و بەردەوامییان پێدراوە.

لەبەرئەوەی یەکەمین پلەداریەکان بەگشتی بەشێوازی پیاوسالاری سەر ژنانە، دەشێت یەکەمین کێشەی کۆمەڵایەتی بە کێشەی ژن ناو ببرێت. دواتر لەمیانەی ئیاهام گرتن لە کۆیلایەتی ژنان چینە کۆمەڵایەتییەکان ئافرێنران، لەگەڵ دەرکەوتنی چینی کۆیلە قۆناخی ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانە دەستی پێکرد کە هیچ جیاوازییەک لە نێوان رەگەزدا ناکات. بەمجۆرە پلەداریو جیابوونەوەی چینایەتی لەناو کۆمەڵگادا تێکەڵ بە یەکتری بوون، قۆناخی کۆمەڵگا بە کێشەکان دەستی پێکرد کە هەنگاو بە هەنگاو لە سەرجەم بوارەکان بەکاریگەربوو. رەگەزگەراییو چینگەرایی مۆرکی خۆی لە سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگادا.

یەکەمین کۆڵەکەی مۆدێرنیتە واتە سەرمایەداری کاتێک دەرفەتی بەسیستەمبوونی بۆ رەخسا بەلەناوبردنی گۆمەڵگابوونەسەرەکیەکانی بەر لەمێژوو و دواتری دەستبەکار دەبێت. بەر لەهەموو شتێک لەژێر ناوی "ڕاوەدوونانی ژنەجادووگەرەکان" هێزی خۆڕاگری کۆمەڵگابوونی ژنانی لەناو کلپەی ئاگردا سووتاند. ناشێت راوەدوونانی ژنەجادووگەرەکان لە دەرەوەی سەرمایە بیری لێبکرێتەوە. سەرمایەداری تا دوارِادە کەڵکی لەو شانۆیانەی گرِتێبەردان وەرگرتووە بۆ ئاواکردنی هەژموونگەراییەکەی سەر ژن کە بە شێوەی قووڵترین کۆیلایەتییە. ئەگەر لەرۆژی ئەمرِۆماندا ژن بەسۆزانیکراوترین دۆخەوە لەخزمەتی سیستەمدایە، بەهۆی پەیوەندییەبەهێزەکەیەتی لەگەڵ ئەو سووتاندنانەی لەقۆناخی سەرهەڵدانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری هاتەئاراوە. ساتە مەترسیدارو شۆکەکانی سووتاندن لە ئەوروپا ژنی خستۆتەژێر خزمەتی بێ سنووری پیاوەوە.

دوای ژن بەشێوەیەکی زۆر بێ بەزەییانە سیستەم کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوندیشی رووخاندووە. لەبەرئەوەی لایەنی کۆمیناڵی دیموکراتییانەی کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند لەسەرپێیان بمێنێت زۆرترین قازانج و دەسەڵات بەدەست نایەت، بەئامانجگرتنی دەست لێبەرنەدراوە. ژیانی مۆدێرنی زاڵ لەدەوروبەری کۆنترین کۆیلە، واتە لەدەوربەری ژن تەواو بووە بە تەڵەزگە. لە سەرمایەداری ژن بە دۆخێکی ئەوتۆ گەیەنراوە، ئەگەر بڵێین "شاژنی کاڵا" لەجێگای خۆیدا دەبێت. تەنیا بەبێ کرێ ناخرێتە کارەوە، بەڵکو خاوەن کەمترین کرێیە و سەرەکیترین ئامرازی داخستن یان کەمکردنەوەی کرێیە. لەپێشترین فاکتەری کارپێکردنی نەرمە. ئامێرێکی پیشەسازی زاوزێیە کە بەردەوام نەوەی نوێ بۆ سیستەم بەرهەم دێنێت، سەرەکیترین ئامرازی پیشەسازی ریکلامە. ئامرازی بەدیهێنانی دەسەڵاتی رەگەزپەرستی یە. لە ئیمپراتۆری جیهانیگیریەوە تا دەگاتە ئیمپڕاتۆرە بچووکەکەی ناو خێزان ئامرازی دەسەڵات و ئارەزووی سنوور نەناسی سەرجەم پیاوە ستەمکارو باڵادەستەکانە. ئەو ئۆبژەیە کە دەسەڵاتی ئەو

کەسانە دەئافرێنێت کە هیچ دەسەڵاتێکیان نییە. لەهیچ سەردەم و قۆناخێکی مێژوودا وەک سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ژن نەقۆزراوەتەوەو خراپ بەکار نەهێنراوە.

دوای ئەو زیادکردنانەی سەرمایەداری خستییە سەر سیستەم، بینینی رووخساری ژن لەئاستی بەکاڵاکردن زیاتر لەڕاستیمان نزیک دەکاتەوە. زۆر چاک دەزانین لەسەردەمی کۆیلەداری کۆن هەرە زێدە ژن لەبازاڕەکاندا دەکڕا و دەفرۆشرا. لەکۆیلایەتی دەرەبەگایەتیشدا ئەم رەوشە بەشێوەی کەنیزەکی (جاریە) بەبەرفراوانی درێژەی پێدرا. لێرەدا ئەوەی وەک یەکپارچە فرۆشراوە ژنە. نەخت شێوەیەکی بەرژەوەندیپەرستی سیاسییە کە لەناو خێزاندا رەنگ دەداتەوە. هەرچی لەسەردەمی سەرمایەدارییە وەک قەساب لاشە بۆ چەندین پارچە لێک جیا دەکرێتەوە، هەربەشێکیش نرخی تایبەتی خۆی هەیە. لەقژیەوە تا پاژنەی پێی، لە سنگیەوە تا رانەکانی، لەورگی تا دەگاتە ئۆرگانی زایەندی، لەباوەشیەوە تا ئەژنۆکانی، لە پشتییەوە تا پووزی، لەچاوەکانی تا لێوەکانی، لەگۆناکانی تا ملی، پارچە پارچە دەکرێ و هیچ شوێنێک نامێنێ نرخی بۆ دانەنێن. بەداخەوە هەر تەنیا ئەم پرسیارە ماوە بە ئەقڵیاندا بێت ئایا رۆحی هەیە یان نا؟ ئەگەر هەبێت نرخەکەی چەندە؟. لەبواری مێشکیشدا بە " کەم ئەقڵە ئەزەلیەکە " دەبینرێ. کاڵای ئارەزووبەخشی سۆزانیخانە تایبەت و گشتییەکانە. ئامێری منداڵ دروستکردنە. لەدایکبوونی منداڵ، کەزەحمەتترین ئەرکە، بەرەنج لەقەڵەم نادرێت.لەتەواوی دەزگا ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و سەربازییە گرنگەکان جێگاگرتنیان سەمبولییە. کەرەستەی ژیانیی و دەستلێبەرنەدراوی رەکلامەکانە. رەگەزەکەی تاکە هەبوونێکە کەهەرە زێدە دەکرێتە کاڵا و لەبازاڕەکاندا نمایش وپێشکەش دەکرێت، هەرە زێدە دەکرێتە بابەتی جنێودان، لێدان و کوتان. هەرە زێدە دەکرێتە ئامرازی درۆی ئەشق، پێشوازی لەهەموو شتێکی خۆی دەکات. ئەو ناسنامەیە بۆ ئەوەی قسە بکات، زمان و وشە و سیستەمێکی تایبەتی دەنگ شێوەی پێدەدرێت. ئەو مرۆڤەیە کە بەمرۆییبیانە هاوڕێیەتی لەگەڵدا ناکرێت. ئەو مرۆڤەیە کە تەنانەت لەلایەن بژاردەترین پیاویشەوە دووچاری هێرشی سۆزداری دەبێتەوە. ئیتر ژن بابەتێکە کە هەموو پیاوێک وەک ئیمپراتۆر خۆی بەسەردا دەسە پێنێ.

لەبەر ئەوەی کۆیلایەتیەکانی دیکە . کۆیلایەتی مناڵ و پیاوان . لەسەر شوێن پێی کۆیلایەتی ژن پێشخراوە، لەو ژیانە کۆمەڵایەتیەی سەرمایەداری دەیسەپێنێت جگە لە ئەفەندی (سەردار ) ەکان، وەک چۆن هەرکەس دەکرێت بەمنداڵ کراون بەکۆیلەش. ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای رۆژی ئەمرۆمان هاوشێوەی بەمنداڵکردنی بەساڵاچوونێک. هەم کراوە بە منداڵ هەم کراوە بە ژن. گوتەی " گەلان و کۆمەڵگاکان حەزدەکەن وەک ژن بەرێوە ببرێن "ی هتلەر گوزارشت لەو راستییە دەکات. خێزان کە لەدەوروبەری ژن پێکهاتووەو کۆنترین دامەزراوی کۆمەڵگایە، دیسان لەدەوروبەری ژن بەڵام ئەوجارە تەواو لەدۆخی هەڵوەشانەوەدا دەژیت. شێوازی کەڵەکەکردنی سەرمایەداری خێزانی هەڵوەشاندەوە. لەبەر ئەوەی تەنیا لەمیانەی لەناوبردنی ئەو شێوازەی کۆمەڵگا کەڵەکەکردن بەدیدێت، ئەوا ئەنجامێکی چاوەڕوانکراوە کە بەو رادەیەی خانەی سەرەکی کۆمەڵگا واتە بەو رادەیەی خێزان هەڵوەشێنێتەوە دەتوانێت کۆمەڵگا لەناو ببات و وەک ئەتۆم ورد و خاشی بکات. وەک چۆن کۆیلایەتی ژن ئاستی کۆیلایەتی کۆمەڵگا دیار دەکات، رەوشی کائۆسی پەیوەندی نێوان ژن . پیاویش رەوشی کائۆس و ناکۆکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رۆژی ئەمرۆمان پیشان دەدات.

کێشەی زیادبوونی زێدەرۆیانەی ژمارەی دانیشتوان لەکێشەی چینایەتی زیاتر هەرەشە لە کۆمەڵگا و جیهان دەکات. زیادبوونی رادەبەدەری ژمارەی دانیشتوان لەنزیکەوەگرێدراوی کۆمەڵگای رەگەزگەرا و مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. ئارەزووی زایەندی کە رۆژانە بیست و چوار کاتژمێر هێورنابێتەوە، کولتووری خێزان و خانەدانێتی لەگەڵ سیاسەتی زیادکردنی دانیشتوانی سەرمایەداری و دەوڵەت . نەتەوە لە پێناو بە دەستهێنانی هێز و قازانج تەڤینەوەی ژمارەی دانیشتوان لەگەڵ خۆیان دێنن. کاتێک رۆڵ و کۆمەکی پزیشکی و تەکنۆلۆژیاشی بێتەسەر، ئەو واقیعەی دێتەئاراوە، مەترسیدارترین دۆخ سەبارەت بەبەردەوامبوون و بەردەوامنەبوونی کۆمەڵگا و ژینگەجێگای باسە. کائۆسی دیموگرافی گرێدراوی ئەو واقیعەیە. لەمێژەهەسارەو ژینگەکەمان بەسنوورێک گەیشتووەچیتر بەرگەی ئەو قەبارە( ٦,٦ ملیار دانیشتوانی جیهان و زیادبوونیشی بەردەوام بێت) ناگرێت. لەم لایەنەشەوە هەڵسەنگاندنی ئیفلاسکردنی سیستەم گرنگە.

پێویستە زۆر بە باشی بزانرێت کە ئەو ژنەی وەک ئامرازێکی وەچەخستنەوەی زۆر بەکاردەهێنرێت خراوەتە ژێر بارێکی ترسناک و بەرگەگرتنی ئاستەمە. کێشەکە زۆر لەولاتری بوون بە خاوەنی منداڵە، سەرچاوەی خۆی لە سیستەمێکی زۆر قورسی بێگارییەوە وەردەگرێت. هەروەها پێویستە زۆر بە باشی بزانرێت کە وەچەخستنەوە دیاردەیەکی سیستەماتیک و کولتوورییەنەک بایۆلۆژی. سەبارەت بەو کولتوورەی لە ئارادایە؛ هەر منداڵێکی لەدایک دەبێت چەندین جار مانای مردنی ژنە نەک تەنیا جارێک. کولتوورێکی وەچەخستنەوە پێویستە؛ ژمارەکەی زۆر کەم بێت، گشت تەگبیرە تەندروستیەکانی وەرگیرابێت و پێش هەموو شتێکیش لەبواری زهنەوە ئامادەکرابێت. لەجیاتی ئەوەی فیکری دێز و ئەبەدییەت لە سەر بنەمای منداڵ و وەچەخستنەوە بونیاد بنرێت، دەستەبەرکردنی لە میانەی پەرەپێدانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی، جوانی و مەعریفەی رەها مانادارترە؛ شیکارکردنی بەخێوکردنی منداڵان بەگوێرەی ئەو ئەولەویاتانە باشتر دەبێت. بە کورتی پێویستە کێشەی بەخێوکردن و پێگەیاندنی منداڵان لەسەر بنەمای فەلسەفەی ئازادی و پێویستیەکانی کۆمەڵگای ئیکۆنۆمی و ئیکۆلۆژی چارەسەر بکرێت. تەواوی ئەو باسانەی لەچوارچێوەی کێشەکانەوە ئاماژەمان پێکردن لەراستیدا لەمیانەی لایەنەئایدیۆلۆژی و ئابوریەکەشیەوە هەوڵی خستنەرووی دراوە. لەوانەیە بەشتێکی سەمەرەی بزانن، بەڵام بەگوێرەی من سەرباری هەوڵەکانی داگیرکاری و چەوسانەوە خاوەنە راستەقینەکەی ئابووری ژنە. ئەگەر لەبواری کۆمەڵناسییەوە بخوازین هەڵسەنگاندنێکی واتادار لەبارەی ئابوورییەوە بکەین، راستترین هەڵوێست ئەمەیە: مادام نۆ مانگ منداڵ لەسکی خۆیدا بەخێو دەکات، دوای زایینێکی پڕ بە ئازار و زەحمەت تا بە ئاستێکی دەگەیەنێت کە منداڵەکە بتوانێت پشت بەخۆی ببەستێت هەر ئەو بەخێوی دەکات، هەروەها پیشەی بەخێوکردنی ماڵ دیسان هی ژنە، کەواتە هێزی هەرە سەرەکی ژنە. وەڵامەکەی من، وەڵامێکی کۆمەڵناسییە کە بەرامبەر بە راستی بەرێزە. مسۆگەر پەیوەندییەکەشی بە بایۆلۆژییەوە رەچاو دەکرێت. نەک هەر ئەمە بەڵکو رۆڵی لە شۆڕشی کشتوکاڵ و بەملیۆنان ساڵ کۆکردنەوەی خواردەمەنیدا، تائێستاش دەریدەخات کە تەنیا لە ماڵەوە نا، بەڵکو لەزۆربەی بوارەکانی ژیانی ئابووریدا ئەوەی چەرخ دەسووڕێنێت هەر ژنە. یۆنانییە کۆنەکان کە خاوەن شەرەفی دانانی بناخەی زانستەکانن، کاتێک ئابوورییان بە یاسای ماڵ، یاسای ژن بەناوکردووە هەزاران ساڵ بەر لە ئەمڕۆ ئەم راستییەیان دەستنیشانکردووە.

بێگومان ئەوانەی بەپلەی دووەم بەدوای ژنەوە دێن ئەو چین و توێژانەن کە وەک کۆیلە، سەپان: لەلایەن هێزەکانی شارستانییەوە کە هونەری سەرەکییان زەوتکردنی زێدەبەرهەم و زێدەبەهایە بەردەوام لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵدا بەکار دەهێنرێن. ئەوانەی بەپلەی سێیەم دێن، هەموو جۆرە پیشەکارێک، بازرگانی بچووک، دوکاندار و جووتیارەکانن کە پارچەزەوی بچووکیان هەیە و کەمێک ئازادترن. کاتێک پسپۆڕییە سەربەستەکانی وەک پزیشک، بیناسازی، ئەندازیار و.. هتدیشی بخەینە سەر کەم زۆر تابلۆکە تەواو دەبێت.

سەرمایەداری دوژمنی ژنانیشە، کە خوڵقێنەر و هێزی سەرەکی ئابوورین. تەواوی شیکارەکانمان دەیسەلمێنێت کە جێگای ژن لە ژیانی کۆمەڵایەتی و بەهای ئابووری لەپێشەوەیە و ئاستێکی بەرزی هەیە. هەروەکو چۆن لە تەواوی مێژووی شارستانیدا لە ئارادا بووە، لەسەردەمی سەرمایەداریدا کە بێ رەحمترین قۆناخێتی بەوەی راستینەی "ژنی لە ئابووری دابڕێنراو"ی تێدا هێنراوەتە کایەوە، بووە بە کاریگەرترین و قووڵترین ناکۆکی کۆمەڵگا. بەشی هەرە زۆری ژنان بێکار هێڵراونەتەوە. سەرباری ئەوەی کارەکانی ماڵەوە سەختترین کارە بەقەدەر پێنج فلس نرخی نییە. سەرەڕای ئەوەی وەچەخستنەوە و بەخێوکردنی منداڵ قورسترین کاری ژیانە، تەنیا بەبێ نرخکردنی ناوەستن، ئیتر بە بەڵایەکیشی دەبینن. هەم هەرزانە، بێکارە، ماکینەی خستنەوە و بەخێوکردنی منداڵە، هەم بێ کرێیە و تەنانەت تاوانباریشە! بە درێژایی مێژووی شارستانیێتی ژن لە نهۆمی (ئاستی) هەرە خوارەوەی کۆمەڵگادا جێگیرکراوە. بەڵام هیچ کۆمەڵگایەک بەشێوەی سەرمایەداری فۆستنەوەی بەرێوەنەبردووە و نەیکردووە بە سیستەم. ئەمجارە نەک تەنیا لە نهۆمی خوارەوە، لەسەرجەم نهۆمەکان ژن ئۆبژە (بابەت)ی ئایەکەسانی، نەبوونی ئازادی و دیموکراسییە! لایەنی سامناکتر ئەوەیە، بەشێوەیەک کە لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوودا بەراورد ناکرێت، کۆمەڵگای رەگەزپەرست بەشێوەیەکی دژوار و بەرفراوان دەسەڵاتی خۆی لە رێی مەحرەمترین ئۆرگانەکانی مرۆڤەوە مەرجدار و زیاد دەکات، ژن دەکات بە پیشەسازییەکی زایەند (سێکس)، ئەشکەنجە لەناو سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگادا بڵاودەکاتەوە، لە قۆناخی شارستانی

سەرمایەداریدا "کۆمەڵگای پیاوسالاری" دەگەیەنێتە بەرزترین ئاست، هەروەکو بڵێی تۆڵە لە "ئیکۆنۆمۆس" خولقێنەری ئابووری دەکاتەوە، لە هەموو شوێن و زەمەنێکدا دوژمنایەتی ژن و ئابووری دەکات.

وەک وشە ئابووری (ئۆکۆنۆمی) تایبەت بە دونیای گریک ـ هێلین ی چاخی کلاسیکە. پێناسەکردنی وەک یاسای خێزان، لەلایەکەوە ئاماژە بە پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژندا دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە پێگەی دەسەڵاتی سیاسی باو ئاشکرا دەکات. ئەوانیش هەروەکو ئەو رۆڵەی پاوانکارییەکان لەسەردەمی سەرمایەداریدا دەیبینن، وەک پاوانی سیاسی هەمان رۆڵ لەسەر ئابووری دەبینن.

پیاوی بەهێز و فێڵباز، لە هەنگاونان بۆ پیاوی باڵادەستەوە دەست پێدەکات، تا دەگاتە ئەوانەی ئەمڕۆ لەناو ناوەندەکانی هێزی سوپەردا جێگیربوون رێگایەکی درێژ، پڕ پێچوپەن و پیلانگێڕی دەگرێتە بەر. پشکنینی ئەو شوێنانە گرنگە کە ئەم پیاوانە هەندێک جار بەئاشکرا جارانێکیش بە نهێنی خۆیان تێدا حەشارداوە. بەردەوام بەشێوەی هێزێکی ستراتیژی وێناکردنیان لەناو تەکتیک و هەڵمەتەکانی کۆمەڵگا (ئابووری، سیاسی، سەربازی)دا ئێمە زیاتر لە زانیارییەکانیان نزیک دەکاتەوە. پیاوی فێڵباز و بەهێز وەک دزێک کەوتە ناو ئابووری ماڵەوەی ژن. تەنیا بەتاڵانەوە نەوەستا. لەوەش مەترسیدارتر، ژنی خستە ژێر لاقەکردنی بەردەوامی خۆیەوە، لانەی پیرۆزی خێزانی کرد بە پێخەفی چل جەردەکان. هیچ کاتێک دەستبەرداری رەوشی رۆحی ئەو خائینە نەبوو کە دەزانێت چیدەکات. بۆ یەکەمین جار تۆوی کەڵەکەکردنی سەرمایە لەم دوو شوێنە چێندرا. یەکەمیان، لەنزیکی ئابووری ماڵ، بەتایبەتیش داگیرکردنی ماڵ؛ دووەمیان، لەناوەند یان نزیک بارەگاکانی ئەو چل جەردانەی بەشێوەی پاوانی تایبەت بەرامبەر بە پاوانی مەشروع و فەرمی دەوڵەت شوێنیان گرت. لەبەرئەوەی لەژێر چاودێری کۆمەڵگا و دەوڵەت رایدەکرد، هەر لە زووەوە بەشێوەیەکی شاراوە و دەمامکدار لەم شوێنانەدا گەڕا. بۆسەی دانا، کاتێک هەلی بۆ رەخسا وەک شێر خۆی بۆ نێچیرەکەی فڕێدا. هەندێک جاریش بە فێڵبازی رێویانە نێچیرەکەی خۆی دەستگیرکرد. هەروەکو بوقەلەموون بەگوێرەی هەرزەمینەیەک رەنگ و شێوەی خۆی گۆڕی. لە خاڵە مارژیناڵەکاندا خۆی کرد بە پسپۆڕی بازرگانی.

لەهەر بوارێکی چالاکی ئابووریدا بەرامبەر بەزۆرترین بەرهەم و سوودبەخشیدا مامەڵەکردنی کۆمیناڵ لەسەر خاک و ئامرازدا نموونەییترین هەڵوێستە. ژن کەلەئابووریدا بەدەرنراوە، لەناوەرۆکدا ئافرێنەری راستەقینەی ئابوورییە. لەبەرئەوەی ئافراندنەکانی ژن لەپێناو پێداویستییە ئابوورییە سەرەکییەکانە هەربۆیە نەدووچاری تەنگژەدێت؛ نەدەوروبەر پیس دەکات و نەهەڕەشەلەکەش و هەوا دەکات. کاتێک کۆتایی بەو بەرهەمهێنانەبهێنرێت کەتاکەئامانجی بەدەستهێنانی قازانجە، بەراستی ئەو کاتەرزگاری جیهان دەست پێدەکات. ئەمەش دەبێتەئازادی مرۆڤ و ژیان.

رەگەزگەرایی (رەگەزپەرستی) کۆمەڵگا دەستەواژەیەک نییە تەنیا بەو دەسەڵاتە سنووردار‌بێت کە لە پەیوەندی نێوان ژن ـ پیاو جێگای باسە. گوزارشت لەدەسەڵاتگەرێتییەک دەکات کەلەهەموو قوژبن و ئاستێکی کۆمەڵگادا بڵاوبۆتەوە. دەسەڵاتی دەوڵەت پیشاندەدات کەلەرێگای مۆدێرنیتەوەبەبەرزترین ئاستی خۆی گەیشتووە. هیچ شتێک بەقەدەر ژنی ئۆبژەکراو ورژێنەر نییەو نابێتەبابەتی دەسەڵات. وەک هەبوونێکی بەئۆبژەکراو ژن خاوەن خەسڵەتی زیادکردنی دەسەڵاتە. بەردەوام لەپێگەیەکدا رادەگیرێت کەدەسەڵات زیاد بکات و وروژێنەربێت. لەم چوارچێوەیەدا شیکارکردنی پەیوەندی ژن بەدەسەڵاتەوەسەبارەت بەئاشکراکردنی حەقیقەتەکەی گرنگ و بایەخدارە. هەر پیاوێک بەزیادەوەخاوەن زهنیەتێکی بەمجۆرەیەکەبرسێتی دەسەڵات لەسەر ژن دابرێژێت. هەمان زهنیەت بەشێوەی توڕەیی و چڵێسی دەسەڵاتی تاکەکانی رەگەزگەرایی ژن لەسەر یەکتر و منداڵان زیاد دەبێت و جێبەجێدەکرێت. ئەو جارەژن دەبێت بەگورگی ژن. ئەمە ئەو رووداوەیە کە بەپەرچەکرداری یەک بەدوای یەک ناودەبرێت. رۆڵی ژن لەسیستەمی چەوسانەوەی سەرمایەداریدا روونتر و لەبارترە. تەنیا بەبێ کرێ بە وەچەخستنەوەو گەورەکردنی بۆ سیستەم سنووردارنابێت، بەڵکو بەکەمترین کرێ دەخرێتەناو هەر ئیش و کارێکیشەوە. لەرێگای سوپای بێکارانەوەبەردەوام لەپێگەی کەمکردنەوەی کرێو سەرکوتکردندا رادەگیرێت. چەندەبەئێش و ئازارەسەربازی ئەوەی خاوەنی بەپەژارەترین رەنجەبەڵام هیچ باوەڕییەک ـ مارکسیستەکانیش لەناودا ـ پێویستی ئاماژەکردن بەرەنج و مافەکانی ژن نابینێت.

هەر بۆیەش شیکار و هەڵوێستی سیاسی پێویست پیشاننادەن. یەکێک لەو نیشانانەی بەربڵاوی ڕەگەزگەرایی کۆمەڵایەتی باڵادەستی پیاو دەسەلمێنێت پەیوەست بەڕەنجی ژنە.

ئەو پیاوسالارییەی پلەداری نەریتی باو لەسەر ژنی ئاواکردووەبەدرێژایی مێژووی شارستانی بەهێزو پتەوکراوە. ئەو دەسەڵاتەی لەفۆرمی دەوڵەت ـ نەتەوەدا بەبەرزترین ئاستی خۆی گەیشتووەتارادەیەکی زۆر مێژی خۆی لەو ڕەگەزگەراییەوەردەگرێت کەخەستو بڵاویکردۆتەوە، چونکەڕەگەزگەرایی کردەیەکی بایۆلۆژی ئاسان نییە؛ بەڵکو ئایدیۆلۆژیایەکە بەلانی کەم بەقەدەر میللیگەرایی دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوەبەرهەم دێنێت. چونکەڕەگەزی ژن لەڕوانگەی پیاوی باڵادەستەوەئەو ئۆبژەو شتگەلەیەکەهەر جۆرەئارەزوویەکی خۆی لەسەر جێبەجێدەکات. گووتەی "ژنان کێڵگەی خۆتانن، چۆن خوازیارن دەتوانن بیان کێڵن" ی پەرتووکی پیرۆزو گووتەی " ژن وەک ئامرازێکی مۆسیقایە، چۆن دەخوازن دەتوانن بیژەنن" ی مۆدێرنیتەئەو واقیعەدەردەبڕن. هەروەها پەندی" قامچی سەریو جاشکۆکەی زگی کەم مەکەن" کارەکتەری فاشیستانەی باڵادەستی دەخاتەڕوو.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش ئەو سیستەمەی زیاتر بەرەو پێشەوەبردووە. ئەو گۆڕانکارییانەی لەبواری یاسا لەبەرژەوەندی ژن ڕێکخراون لەبەدەستهێنانی یەکسانی کردەییدا دوورە. دەشێت هاوسەرگیری وەک دامەزراوێک پێناسەبکرێت کەلەژێر مۆرکی شارستانی ئاواکراوە. باڵادەستی پیاو و ڕەگەزپەرستی کۆمەڵگا ڕەوا دەکات. دۆخی ڕەنگدانەوەی پاوانی پلەداری، دەسەڵات و دەوڵەتەلەسەر ئەو یەکینەیەی بەربڵاوەو خانەی کۆمەڵگا پێکدێنێت. ناکۆکیەکی پەردەپۆشکراو لەنێوان ناوەڕۆک و ڕوواڵەتەکەی لەگەڵ ڕەواکردنەکەی جێگای باسە. دەزگایەکەبەباشترین شێوەئەو کۆیلایەتییەدەشارێتەوەکەلەکەسایەتی ژندا بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا پەیڕەو دەکرێت. لەڕێگای بەبنەماگرتنی ئەو قۆناخەی بەژنکردن (سووکایەتی پێکردن، بچووکردنەوە، کردنی بەپاشکۆی پیاو)ی مێ دەستپێکرد هەنگاو بەهەنگاو کۆمەڵگاش دەکرێت بەژن. دوای بەژنکردنی مێکۆیلایەتی پیاویش بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵیدا جێبەجێکراوە. ئەو کۆیلایەتی و ژنێتییەی لەسەر مێیەپەڕەوکراوەو ئەنجامگیر بووە، دواتر بەسەر پیاوان و چینەچەوساوەکانیشدا دەسەپێنرێت. ئەو قۆناخ و پرۆسەی بەشارستانیەوەدەستی پێکرد لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەلوتکەگەیشت. لەپرۆسەی بەژنکردنی کۆمەڵگا فاشیزم پێگەو مانایەکی تایبەتی هەیە. گوزارشت لەکۆمەڵگایەکی دەستەمۆکراو دەکات. مۆدێرنیتەگوزارشت لەکۆمەڵگای ژنێتی گشتی دەکات کەخەسێنراوە، توانای بەرگریکردنی لەدەستداوەو هەرکەس کراوەبەژن و مێردی یەکتری. کەڵەکەبوونی هەمیشەیی سەرمایەپێویستی بەشەڕانگێزی و هۆڤێتییەک هەیەتا بەجۆرێکی دیکە دەرفەت بەکۆمەڵگا نەدات. هاوسەرگیری بوارێکەلەژێر ناوی ناموسدا هەم کۆیلایەتی و دەستدرێژی تێدا ڕەواکراوە هەم بەقووڵایی تێیدا جێبەجێ کراوە.

### ٥. پرسی ڕەگەزگەرایی کۆمەڵایەتی، خێزان، ژن و ژمارەی دانیشتوان.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تەنیا ناوی کێشەکە دەستنیشان کراوە و هێشتا ناوەڕۆکەکەی دیاری نەکراوە. هێشتا دوورە لەوەی کە بەرنامە و ستراتیژ و ڕێکخستن و شێوازی چالاکیەکانی تەواو لە نێو ڕۆژەڤدا جێگیر بێت. هەروەکو چۆن لەسەر بنەمای کۆیلایەتی ڕەگەزی ژن مێژووی شارستانیەتی چینایەتی وەکو مێژووی ستەمکاری؛ شەڕ، چەوسانەوە و تەڵەکەبازی و چەواشەکاری دەستپێکرد، ئەوا لەمیانەی تێکۆشانی ئازادی ژن و گەیشتنی بە سەرکەوتن، سەرلەنوێ مێژووی ئازادی، ئاشتی، یەکسانی و ڕاستی دەئافرێنرێ و دەنووسرێتەوە. تەواوی پێشهاتەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئازادی ژن ڕۆڵێکی بەرچاو لە بەرەبەیانی شارستانیەتی نوێدا دەبینێ و دووبارە و لە ئاستێکی بەرزتردا چاخی ژنی ئازاد دێتە ئاراوە.

شانبەشانی ئەوەی نوێنەرایەتی گەوهەری دیموکراتیزەبوون دەکات، ژن و سیستەمی پەیوەندی و ناکۆکییەکانی دەوروبەری لەسەرووی ئەو دیاردانەوە دێن کەپێویستە بەشێوەیەکی سەربەخۆ تاوتوێ بکرێ. چەندە هاوسەنگییەکانی ڕاوەستەی دیموکراتی و

کۆمەڵکاری بەدرەنگ وەختی و ناتەواو جێگای خۆی لەبواری کۆمەڵناسییەوە گرتبێت، ئەوا ڕەوشێکی لەوەخراپتر لەهەڵوێستی سەبارەت بەدیاردەی ژن دەبینین. هەروەک بڵێی ئەو ڕەوشەی ژن تێیدا دەژی پێویستییەکی ئاسایی و سروشتیبوونە، ئەم چەمکە لەتەواوی هەڵوێستە زانستییەکاندا، هەڵوەستەی سیاسی و ئەخلاقی وەک ئەگەرو گریمانەیەکی لەپێشینە پەسنددەکرێ. ئەوەی جێگای خەم و پەژارەیە خودی ژنیش هۆگری ئەوەبووە کە ئەم چەمک و تیۆریە بەئاسایی و سروشتی ببینێ پەسند بکات. پیرۆزی و سروشتیبوونی ئەو ستاتۆیەی بەهەزاران ساڵ بەسەر گەلاندا سەپێنرا، چەندین جار لەوەزیاتر هەروەکو بڵێی لەتەواوی زهنییەت و هەڵسوکەوتی ژنان هەڵکەندراوە. بەو ڕادەیەی گەلان کراونەتە ژن، ژنانیش وەکو گەلانیان لێکراوە. کاتێک هیتلەر دەڵێ " گەلان وەک ژنن" گوزارشت لەم ڕاستییە دەکات. کاتێک بەشێوەیەکی قووڵتر دیاردەی ژن هەڵسەنگێنرێ و تاوتوێ بکرێت دەبینرێ لەوە زیاتر کەوەک ڕەگەزێکی جەستەیی، بەڵکو وەک چین و ڕەچەڵەکێک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. بەڵام وەک چین، ڕەچەڵەک و نەتەوەیەک کە هەرەزێدە دەچەوسێنرێتەوە. دەبێ باش بزانین کەهیچ چینێک، ڕەچەڵەک و نەتەوەیەک بەئەندازەی ژنێتی نەخراونەتە ژێر کۆیلایەتییەکی سیستەماتیک.

هێشتا مێژووی کۆیلایەتی ژنانە نەنووسراوە. هەرچی مێژووی ئازادیخوازییە لەچاوەڕوانی نووسینەوەدایە. بەئەندازەی قووڵایی کۆیلایەتی ژنان، هێشتنەوەی لەناو تاریکیدا لەنزیکەوە گرێدراوی دەسەڵاتی پلەداری و دەوڵەتگەراییە. لەمیانەی ڕاهێنانی ژن لەبارەی کۆیلایەتییەوە ـ بەڕێوەبەرایەتییە جیاکاری و پیرۆزەکان ـ پلەداری ئاواکراوە، ڕێگای کۆیلایەتی توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگا کراوەتەوە. بەکۆیلەکردنی پیاوان دوای کۆیلایەتی ژنان دەردەکەوێت. کۆیلایەتی ڕەگەزی لایەنی جیاوازی لەگەڵ کۆیلایەتی چینایەتی و نەتەوەیی هەیە. لەمیانەی فشارە وردو چڕو تەڵەکەبازییە پڕ لەهەستەکانەوە ڕەوابوونی مەیسەردەکرێت. هەروەک بڵێی جیاوازی جەستەیی بیانوویەکی کۆیلایەتییەو بەکاریدێنێ. تەواوی ئیش و کارەکانی ئەنجامیدەدات، بەئیشی ژنانەی بێبەها بەناو دەکرێت، بەهەند نابینرێ و سووکایەتی پێدەکرێ. بەشداریکردنی لەگۆڕەپانە گشتییەکاندا، لەلایەنی ئایینیەوە قەدەخە دەکرێ، لەبواری ئەخلاقیشەوە بەعەیبداری لەقەڵەمدەدرێ. پێبەپێ لەتەواوی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان دووردەخرێتەوە. کاتێک هێزی حوکمڕانی چالاکییە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دەکەوێتە ژێرڕکێفی پیاو لاوازی ژن زیاتر بەدەزگا دەبێت. وەک باوەڕییەک لەسەر ڕەگەزی لاواز (ژن) هاوفیکرن.

دوای ئەوەی تەواوی توانستی هێزە ماددی و مەعنەویەکان لەدەستی پیاو کۆدەبێتەوە، ئیتر ژن دەبێتە بوونەوەرێک کە گیرۆدەی خنکانێکی بێدەنگە و بەردەوام زیزدەبێت، چاوەڕوانی دەستی پیاوە، هەندێ جار دەپارێتەوە، هەندێ جاریش تەواوی کەرامەتی خۆی پێشێل دەکات و بەچارەنووسی خۆی ڕازییە. بەواتایەکی دیکەش دەتوانرێ بەمردووی زیندوو بەناو بکرێت. لەمیانەی چەند نموونەو لێکچواندنێکەوە دەتوانین دیاردەکە ڕوونتر بکەینەوە. نموونەی یەکەم، چۆلەکەی ناو قەفەسە. هەندێ جار وەک چۆلەکەی کەناری دەڕازێندرێتەوە، هەندێ جاریش وەک بولبول دەنگی خۆش دەکرێ و بەکاردەهێنرێ. هەرکەسەو لەلای خۆیەوە بەچۆلەکەیەکی دەچوێنێ. زیاتر بەچۆلەکە بەناو دەکرێت. نموونەیەکی دیکە، ڕەوشی ئەو پشیلەیە کە فڕێدراوەتە بیرێکی قووڵی بێبن و بەردەوام میاوەمیاوێتی. پاشماوەی خواردنەکانی دەدرێتێ و بۆ خاوەنەکەی ماڵیدەکرێت. لەوانەیە ئەم نموونانە کەمێک قەبا ببینرێن، بەڵام بۆ تێگەیشتنی قووڵایی کۆیلایەتی ئاشکرایە کە پێویستی بەهەوڵدانێکی هەمەلایەنی زانستی و ئەدەبی هەیە. کۆمەڵگایەکی ڕەگەزگەرایی زەبەلاح پێکهێنراوە. قەبایی ڕاستەقینە لێرەدایە کاتێک پیاو یەکلایەنە دەستدرێژی دەکاتە سەر ژن بۆ پیاو قارەمانێتییەو تادوارادە پیاو زەوقی لێوەردەگرێ و شانازی پێدەکات، ژن ڕووبەڕووی هەموو جۆرە سزایەکی بێڕەحمانەی لەجۆری ڕەجمکردن تامردن، فڕێدانە سۆزانیخانەکان و تا دەگاتە لاتەریککردنی لەکۆمەڵگا دەبێتەوە. دیسان یەکێک لە قەباترینیان ئەوەیە، کاتێک پیاو شانازی بە ئۆرگانی زایەندی و نێرینەیی خۆی دەکات، ئۆرگانی زایەندی و مێینەیی بۆ ژنان وەک سەرچاوەی عەیب و خەجاڵەتی دەبینرێ. تەنانەت لەبەکارهێنانی سادەترین جیاوازی جەستەیی دژ بەژن دوودڵی نەکراوە. خودی ژنێتی کراوە بەسەرچاوەی عەیب و شەرمەزاری. تەنانەت ئەشق کە سۆزو هەستێکی پیرۆزە ئەوەی ژنی دووچاری دێت داسەپاندنێکی کوێرانەی پیاوە. کیژۆڵەکان بەبەردەوامی بچووک دەبینرێن.

**ئەو پرسیارەی پێویستە بپرسین بۆچی کۆیلایەتییەکی هێندە قووڵ؟ مسۆگەر وەڵامەکەی پەیوەندی بەدیاردەی دەسەڵاتەوە هەیە. سروشتی دەسەڵات پێویستی بەکۆیلایەتییە. ئەگەر سیستەمی دەسەڵات لەدەستی پیاودابێت ئەوا تەنیا بەشێکی مرۆڤ نا بەڵکو دەبێ تەواوی رەگەزێکیش بەگوێرەی ئەم دەسەڵاتە شێوە بگرێت. هەروەکو چۆن خاوەنەکانی دەسەڵات سنوورەکانی دەوڵەت وەک سنوورەکانی خانە (ماڵ)ی خۆیان دەبینن و هەموو کردەوەیەک لەم سنوورەدا وەک مافێک دەبینن، لەو خێزانەدا کە میکرۆ مۆدێلێکی دەوڵەتە پیاو وەک خاوەنی دەسەڵاتی پیاوسالاری خۆی بەخاوەن مافی هەمووجۆرە رەفتارو کردەوەیەک ـ پێویست ببینێ کوشتنیشی تێدا ـ دەبینێ ژنی ماڵەوە موڵکێکی هێندە قووڵ و کۆنە لەمیانەی هەست و سۆزێکی موڵکایەتی سنوورنەناس پیاو ژن بەموڵکی خۆی دادەنێ. بەرامبەر بەپیاو ژن ناتوانێ بانگەشەی بچووکترین مافی موڵکایەتی بکات ـ لەگەڵ ئەو پیاوەی کە پەیوەندی هاوسەرێتییان پێکهێناوە ـ بەڵام خاوەنداریێتی پیاو لەسەر ژن و منداڵان بێسنوورە. دیسان پێویستە دەرهەق بەخێزان و رەفتارەکانی کۆیلایەتی سەر ژن بۆ سەرچاوەی موڵکایەتی بگەڕێینەوە. ژنی بەکۆیلەکراو سەرچاوەی موڵکایەتی پێکدێنێ. ئەو کۆیلایەتی و موڵکایەتییەی لەسەر ژن بڵاوکراوەتەوە شەپۆل شەپۆل سەرجەم ئاستەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە. بەمشێوەیە هەموو جۆرە هرزو سۆزێکی موڵکایەتی و کۆیلایەتی لە پێکهاتەی رەفتارو هزری تاک و کۆمەڵگا بەجێدەکات. کۆمەڵگا بەگوێرەی پێکهاتەی هەمووجۆرە پلەداری و دەوڵەتگەراییەکان دەگونجێندرێ. ئەمەش بەواتای بەردەوامکردنی ئاساییانەی هەموو جۆرە پێکهاتەیەکی شارستانییەت دێ کە بەچینایەتی دەناسرێت و رەوابوونی بەدەستهێناوە. بەمجۆرە ئەوەی دەدۆڕێنێ و زیانی بەردەکەوێ تەنیا ژن نییە، بەدەر لەهێزێکی سنوورداری پلەداری و دەوڵەتگەرایی، تەواوی کۆمەڵگایە.**

**قۆناخەکانی تایبەتی گێژاو هێندە بۆ ژن گرنگ نییە، چونکە بەردەوام لەناو قەیراندا دەژی. ژن بەواتای ئاسنامەیەکی قەیراناوی دێت. لەقەیرانی هەنووکەی سیستەمی سەرمایەداریدا، تاکە ئومێدی ئەوەیە کەدیاردەی ژن تارادەیەک رۆشنکراوەتەوە. هەرچەندە بەشێوەیەکی ناتەواویش بێت لەدواچارەگی سەدەی رابردوو فێمینیزم (ژنناسی) راستینەی ژنی زەقکردۆتەوە. لەبەر ئەوەی لەمیانەی رۆشنکردنەوەیەکی بەهێز لەقۆناخی گێژاودا شانسی گۆڕینی هەر دیاردەیەک زیاد بووە، دەشێ ئەو هەنگاوانەی لەبواری ئازادی بهاوێژرێن رێگا لەپێش پێهەڵگرتنی چۆنایەتی بکاتەوە. دەشێ ئازادی ژن لەقەیرانی هەنووکەدا دەسکەوتی گەورە بەدەستبێنێ و لێی رزگار ببێ.**

**بێگومان وەک تەواوی جۆرەکانی بوونەوەر ژنیش خاوەن سروشتێکە. رۆژ لەدوای رۆژ زانستی بیۆلۆژی لەمیانەی بەڵگەکانەوە زیاتر دەسەلمێنێ کە ژن لەودیو کۆمەڵایەتی بوونەوە وەک رەگەزێکی بیۆلۆژی ئەندامێکی سەرەکی و ناوەندییە. بەکورتی لەگەڵ ئەوەی جەستەی ژن پیاویش لەخۆوەدەگرێت، جەستەی پیاو ژن لەخۆوە ناگرێت. بە پێچەوانەی پەرتووکە پیرۆزەکان دەرک بەوە دەکرێ کە ژن لەپیاو دروست نەکراوە، بەڵکو پیاو لەژن بەرهەمهاتووە. کرۆمۆسۆمەکانی ژن لەهی پیاو زیاترە. تەنانەت خوێنبەربوونی مانگانە کە وەک لایەنی نێگەتیڤی ژنان نیشاندەدرێت، پێویستە وەک نیشانەی پەیوەندی ئاسکی ژن لەگەڵ سروشت بیری لێبکرێتەوە. پێویستە خوێنبەربوونی منداڵدان وەک لێشاوێکی بەردەوامی ژیانێکی سروشتی ببینرێ. پێویستە وەک ئیرادەی کۆتایی نەهاتن و بەردەوامبوونی رەگی سەرەکی ژیان ببینرێ. ئەو مەسەلانەی بەنەخۆشی ژنان بەناو دەکرێ لەراستیدا دیاردەکانی ژیانن. سەرچاوەی خۆی لەوە دەگرێت کە ژن نوێنەرایەتی سەرچاوەی ژیان دەکات. کێشە ئاڵۆزەکانی ژیان لەناو سک و منداڵدانی ژن دەستپێدەکات. ئەو منداڵەی لەدایک دەبێت و ناوکە پەتکەکەی وەک دوا ئەڵقەی پەیوەندی ژیانە. بەرامبەر بەم راستیانە پیاو وەک پاشکۆ یاخود بەردەوامی ژن دەبینرێ. بابەتێکی دیکەی ئەم دیاردەیە دەسەلمێنێ و پشتڕاستی دەکاتەوە هەست و سۆزی زیندەڕۆ و بآ واتای ئیرەیی پیاوە. لەکاتێکدا سروشتی ژن بەشێوەیەکی باوەڕمەندتر بەرامبەر خۆی دەوەستێ، پیاو ناتوانێ خۆی لەسەر پێیان بگرێ و ئارامی نییە، وەک بڵێی بەلایەکەو لەدەوروبەری ژن دەسووڕێتەوە. تەواوی ئەم تێڕوانینانە دەسەلمێنن کە جەستەی ژن بەلاوازی بارگاوی نەکراوە، بەڵکو ناوەندێکە. هەربۆیە بەر لەهەموو شتێک پێویستە ژن بەپەلە و راستەوخۆ پێناسەی ناتەواو و نەخۆش رەتبکاتەوە کە کولتووری باوکسالاری دەیسەپێنێ. پێویستە وەها بکات کە پیاو هەست بەراستی پێچەوانەی بانگەشەکەی بکات. کاتێک دەڵێین پێویستە ژن لەبواری جەستەییەوە بڕوای بەخۆی هەبێت مەبەستمان ئەم راستینەیەیە.**

ئاکامی سروشتی ئەو پێکهاتە جەستەییە بەهێزبوونی ژیری سۆزدارییە لای ژنان. ژیری سۆزداری ئەو ژیرییەیە کە لەژیان دانەبراوە. ئەو ژیرییەیە کە بەشێوەیەکی بەهێز خوێن شیرینی و خوێن ساردی لەخۆوە دەگرێت. تەنانەت کاتێک ژیری ئەنالیتیک لای ژن پێشدەکەوێت بەهۆی بەهێزی ژیری سۆزداری توانستی ئەوەی زیاترە کە هاوسەنگ بێ و گرێدراوی ژیان بێت و دوور لەرۆڵی تێکدەرانە دەوەستێ. پیاو هێندەی ژن لەواتای ژیان تێناگات. ژن کە خودی ژیانە ـ بەزمانی کوردی گروپی ئاریانی Jin واتە ژین Jîn، لەهەمانکاتدا بەواتای Jin ژنیش دێت ـ توانستی بینینی ژیانە لەمیانەی راستینەی خۆی و دوور لەرِیاکاری. ئەم توانستەی بەهێزە. لەژیانی کەسێتی خۆشماندا ئەم راستییە باش دەزانین. پیاو بەرپرسیاری بێ بەزەییانەی سیفەتەکاتی لەجۆری فێڵبازی، نارِەسەنی، خراپەکاری و سۆزانی و ... هتدە کە دراونەتە پاڵ ژنان. هەر ژنێک، کە لەدۆخی سروشتی خۆیدا مابێتەوە، پێویستی بەتەڵەکەبازی و سۆزانێتی نابینێ. لەبواری جەستەیی و بیۆلۆژیشەوە بۆ ئەمە لەبارنییە. خوڵقێنەری راستەقینەی تەڵەکەبازی و سۆزانێتی پیاوە. هەروەکو دەزانین یەکەمین سۆزانیخانەی لەسالآنی ٢٥٠٠ ی پ. ز لەسەردەمی سۆمەریەکان لەشاری نیپوری پیرۆز بەناوی موسافقەتدیم کردەوە دەسەڵاتی پیاو بوو. سەرباری ئەمەش بەشێوەیەکی بێ شەرمانە هەروەکو بڵێی سۆزانێتی داهێنانێکی ژنە بەردەوام بەزیندوویی دەیهێڵێتەوە. بەرهەمی خۆی، واتە ئەو تاوانباریەی ئافراندوویەتی دەیکاتە موڵکی ژن و لەمیانەی پێشخستنی چەمکێکی ساختەو دروستکراوی نامووس، لێدان و نەفرەت و قڕکردن لەسەر ژن کەمناکاتەوە. ئەو ئەنجامەی دەتوانین لەو پێناسە زیادەدا بەدەستی بێنین، بەر لەهەموو شتێک رووبەڕووبوونەوەیەکی تۆکمەیە بەرامبەر هێرشی ئایدیۆلۆژی پیاو. پێویستە بەرامبەر ئایدیۆلۆژیای پیاوسالاری، لەمیانەی ئایدیۆلۆژیای رزگاری ژندا فێمینیزم و سەرچاوەکەی (سەمایەداری) تێپەڕبکرێت و لەرێگای خۆپڕچەککردن (لەبواری هزری، رێکخستنی) تێکۆشان بەڕێوەببرێت. پێویستە بەرامبەر زهنییەتی دەسەڵاتی باوکسالاری پیاو زهنییەتی رێکخستنی و سروشتی ژن تۆکمە بکرێت و بەرلەهەموو شتێک لەبواری ئایدیۆلۆژیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنرێ. نابێ لەبیربکرێ کەنەریتی باوی ملکەچکردن (تەسلیمییەت)ی ژن جەستەیی نییە، بەڵکو کۆمەڵایەتییە. لەو کۆیلایەتییەوە دێت کە لەناواخندا بەجێکراوە. لە دۆخێکی وەهادا بەرلەهەموو شتێک پێویستە لەبواری ئایدیۆلۆژی هزرو سۆزی تەسلیمکاری لەناو ببرێت.

کاتێک ئازادی ژن روو لەگۆڕەپانی سیاسەت دەکات دەبێ باش بزانێ کە رووبەڕووی دژوارترین لایەنی شەڕ دەبێتەوە. لەگۆڕەپانی سیاسەتدا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ، هیچ سەرکەوتن و دەسکەوتێک هەمیشەیی نابێت. سەرکەوتن لەبواری سیاسیدا بەواتای بزووتنەوەی دەوڵەتگەرایی ژنان نایێت. بەپێچەوانەوە تێکۆشان بەرامبەر پێکهاتە دەوڵەتگەراو پلەدارییەکان، بەواتای ئافراندنی ئەو قەوارانە دێت کە ناوەندەکەی دەوڵەت نییە، ئامانجی گەیشتنە بەکۆمەڵگای دیموکراسی، ژینگەیی و ئازادی رەگەزی. هەرە زێدە پلەداری و دەوڵەتگەرایی لەگەڵ سروشتی ژندا ناگونجێ و ناکۆکە. هەربۆیە لەپێناو گەیشتن بەقەوارەی سیاسی دیموکراتی و دژە پلەداری و دەوڵەتگەرایی پێویستە بزووتنەوەی ئازادی ژن رۆڵی پێشەنگایەتی ببینێ. رووخاندنی کۆیلایەتی لەبواری سیاسیدا لەناوەڕۆکدا لەمیانەی سەرکەوتنی تێکۆشانی ئەم گۆڕەپانە فەراهەم دەبێت. تێکۆشانی ئەم گۆڕەپانە پێویستی بەرێکخستنێکی بەرفراوانی ئازادی ژن و تێکۆشانەکەی هەیە. هەمووجۆرە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، مافی مرۆڤ و بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێییەکان ئەو گۆڕەپانانەن کەتێکۆشانی دیموکراتییانەی تێدا رێکدەخرێت و پێشدەخرێت. هەروەک سۆسیالیزم ئەو رێگایەی بەرەو ئازادی و یەکسانی ژنان دەچێت، بە بەرفراوانترین و سەرکەوتووترین تێکۆشانی دیموکراتییانە تێپەڕدەبێت. بزووتنەوەی ژنان دیموکراسی بەدەست نەهێنێ ناتوانێ یەکسانی و ئازادیش بەدەست بێنێ.

گرنگترین کێشەی ئازادی لەبواری کۆمەڵایەتی کێشەی هاوسەرێتی و راستینەی خێزانە. ئەمانە وەک بیرێکی قووڵ و بێبنن. ئەو دەزگایانەی بۆ ژن وەکو رزگاربوون دیارە، لەمیانەی زهنییەتی ئێستای کۆمەڵگا لەجێگۆڕکێ لەقەفەسێکەوە بۆ قەفەسێکی دیکە بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. بەتایبەتیش ناچار دەبێ زیندوویی لاوێتیش لەژێر رەحمی زهنییەتی قەسابگەرایی بەجێ بێڵێت. پێویستە خێزان (عائلە) وەک رەنگدانەوەی کۆمەڵگای بالا (کۆمەڵگای دەسەڵات) لەناو گەل و دەزگا سیخوڕیەکەی ببینرێ. پیاو نوێنەری دەسەڵاتە لەناو خێزان و گوزارشتە چڕکراوەکەیەتی. کاتێک ژن شوودەکات لەراستیدا دەبێتە کۆیلە. زەحمەتە دەزگایەکی دیکەمان بەخەیاڵدا بێت هێندەی هاوسەرێتی کۆیلایەتی بەرهەمبێنێت. لەواتای راستەقینەدا گشتگیرترین کۆیلایەتی لەمیانەی ئەم دەزگایە ئاوادەکرێ و لەرێگای خێزانیشەوە ریشەدادەکوتێ و بەردەوام دەبێت. بەشێوەیەکی گشتی باس

لەبەیەکەوەبوون و ژیانی هاوبەش ناکەین. ئەمە بابەتێکە بەگوێرەی چەمکی ئازادی و یەکسانی هەرکەسێک واتادار دەبێ. بەڵکو باس لەو خێزان و هاوسەرێتییە کلاسیکییە دەکەین کە جێگیربووە. بەواتای ئەوە دێت کە مولکایەتییەکی مسۆگەر دژ بەژن پێشدەکەوێت، لەبوارەکانی هزری، کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی دووردەخرێتەوەو جارێکی دیکە بەسانایی نایێتە هۆش خۆیەوە. تاوەکو بەلێپرسینەوەیەکی رادیکاڵانە تێپەڕ نەکرێت، بنەماکانی ژیانێکی هاوبەش فەراهەم نەکرێت کە ئامانجی دیموکراتی و ئازادی و یەکسانی رەگەزی بێت، ئەوا ئەو پەیوەندی و هاوسەرێتیانەی سەرچاوەی خۆی لەتەنگەتاوی تاک و ئارەزوومەندی و چەمکی باوی خێزان دەگرێت وەک مەترسیدارترین چەواشەکاریەکانی پێش ژیانی ئازاد رۆڵ دەبینین. پێویستی بەمجۆرە بەیەکەوەبوونانە نییە، بەڵکو پێویستە بە شیتەڵکردنی زهنییەت گۆڕەپانی دیموکراتی و سیاسی، ئازادی رەگەزی بەدی بهێنرێ و ئیرادەی ژیانی هاوبەش جێگیربکرێ.

بابەتی ئەشق کە لەجیهانی ئەمرۆماندا وەک بنێشت لەهەموو زارێکدایە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا بەمرادەیە ژێرپێ نەخراوە. لەئەشقی کوێرانەی لەناکاوو ساتەوەختیەوە تادەگاتە هەڵوێستە ئاشکراکانی تاوانباری، تەنانەت مەترسیدارترین و وشکترین و کوێرانەترین شێوازی پەیوەندیش بەئەشق لەقەڵەم دەدرێت. ناتوانرێ بیر لەپەیوەندییەک بکرێتەوە کە لەمە روون و ئاشکراترچەمکی ژیانی سیستەمی سەرمایەداری نیشانبدات. تەنانەت ئەشقی ئەم رۆژگارەشمان ئاشکراترین دانپیانانە بەوەی سەپاندنی زهنیەتی سیستەمی باڵادەست بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگادا لەپیرۆزترین بواریشدا چی لێدەکەوێتەوە. زیندووکردنەوەی ئەشق یەکێکە لەزەحمەتترین ئەرکە شۆڕشگێڕییەکان. پێویستی بەرەنجێکی گەورە، رۆشنگەری زهنییەت و خۆشەویستی مرۆڤ هەیە. یەکێک لەسەرەکیترین مەرجەکانی ئەشق ئەوەیە بەئاراستەی بلیمەتی سەردەم و لەچوارچێوەی سنوورەکانیدا بەرێوەبچێ. دووەمیان بەرامبەر هاربوونی سیستەم راوەستەیەکی مەزن و شکۆدار دەسەپێنێ. سێیەمیان، پێویستە ئەمە وەکو راوستەیەکی ئەخلاقی پەسند بکات کە بەبێ رزگاری و ئازادی ناتوانن تەماشای یەکتریش بکەن. چوارەمیان، پێویستە ئارەزووی زایەندی بکاتە دیلی ئەم سێ خاڵەی سەرەوە. واتە پێویستە ئەوە بزانرێ کە تاوەکو ئارەزووی زایەندی بە بلیمەتی، ئەخلاقی ئازادی و راستینەی تێکۆشانی سیاسی و سەربازی نەبەسترێتەوە، هەر هەنگاوێکی بهاوێژرێ بەواتای نکۆڵیکردنی ئەشق دێت. ئەوانەی هێندەی چۆلەکەیەک دەرفەتی ئاواکردنی هێلانەیان نییە، کاتێک باس لەئەشق و پەیوەندی و هاوسەرێتی دەکەن، واتە بەهای رەسەنێتی تێکۆشانی ئازادی نازانن و تەسلیم بەکۆیلایەتی سیستەمی کۆمەڵایەتی دەبن.

ئەگەر باس لەراستینەی ئەشقی ئەم رۆژگارەمان بکرێت بەهەرحاڵ ئەمە پێویستی بەکەسایەتییەکە کە لەیلا و مەجنون و هاورێکانیان دەرباز دەکات، چەندین سۆفی تێپەڕدەکات، پێویستی بەپاکی و وردکاری زاناکانە، لە گێژاو (کائیوس)ی ئێستا رێگا لەپێش ئازادی کۆمەڵایەتی بکاتەوە، ئازایەتی و فیداکاری و سەرکەوتنی بەدەستهێنابێ و خۆی سەلماندبێت.

کێشەکانی یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابووری ژنانیش، بەرلەهەمووشتێک لەمیانەی شیکاری دەسەڵاتی سیاسی، دەتوانێ لەدیموکراتیزەبووندا وەڵامی سەرکەوتوانە بدۆزێتەوە. ئاشکرایە تاوەکو سیاسەتێکی دیموکراتییانە پەیڕەو نەکرێت، پێشکەوتن لەبواری ئازادی بەدەستنەهێنرێ، ئەوا یەکسانییەکی وشکی یاسایی واتایەکی ئەوتۆی نابێت.

هەڵوێستی هەرەراست بەرامبەر بەژن ئەوەیە کە وەک شۆڕشێکی کولتووری تاوتوێ بکرێت. لەناو کولتووری هەنووکەدا چەندە نیاز پاک بیت و هەوڵیش بدرێت بەهۆی کێشەی خودی دیاردەکە و پێکهاتەی پەیوەندییەکانیەوە چارەسەرییەکی واتادارو ئازادیخوازانە بەدینایەت. رادیکاڵترین و ئازادیخوازترین ناسنامە لەمیانەی نزیکبوونەوە لەژن یاخود دەرکردنی تەواو بە سیستەمی پەیوەندی نێوان ژن ـ پیاو فەراهەم دەبێت. دەبێ باش بزانرێ کە لەمیانەی تێکەڵکردنی سەرپۆشی (حیجاب) لەگەڵ نەریت، پۆرنۆ (سێکسی کراوە) لەگەڵ هاوچەرخێتی، تۆزقاڵێک رێ نابڕدرێت. بەئەندازەی قووڵایی کۆیلایەتی ئەم بوارە، ئەوا قووڵکردنەوەی تێگەیشتن لە ئازادی و کردنی بەئیرادەیەک پێویستییەکە. ئەوانەی لەبواری ئازادی ژن و خۆئازادکردندا مەودایان نەبڕیوە دەبێ باش بزانن کە لەهیچ گۆڕەپانێکی ئازادی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا ناتوانن ببنە هێزی چارەسەری و گۆڕانکاری. دەبێ ئەمە وەک سەرەکیترین پێوانەکانی ئازادی بەبنەما بگیردرێت هەر هەوڵ و کۆششێکی ئازادی دووالیزمی پیاوی باڵادەست ـ ژنی

**کۆیلەی تێپەڕ نەکردبێت، ناتوانێ ناسنامەیەکی راستەقینەی ئازادی بەدەستبێنێ. تاوەکو پەیوەندی موڵکایەتی ـ دەسەڵاتی سەر ژن کۆتایی پێنەیەت پەیوەندی ئازادانەی نێوان ژن ـ پیاو پێشناکەوێت.**

**بینینی ئەم سەدەیەشمان وەک رۆژگاری هەڵکشانی کۆمەڵایەتی ئیرادەی ژنی ئازاد هەڵوێستێکی واقیعییە. بەڵکو بۆ ژنان پێویستی بیرکردنەوەی ئاواکردنی ئەو دامەزراوە هەمیشەییانە بێت کە لەوانەیە سەدەیەک بخایەنێ. دەشێ پێویستی بەپارتی ئازادی ژنان هەبێت. پێویستە جێگیرکردنی ئازادی و پرەنسیپە سەرەکییە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەکانی و پراکتیزەکردنی و چاودێریکردنی هەم بەهانە، هەم ئەرکە سەرەکییەکانی ئەم پارتیانە بێت.**

**بەتایبەتی لەشارەکاندا لەجیاتی خانەی حەوانەوە کە تائێستا بیری لێکراوەتەوە، پێویستە گۆڕەپانی ئازادی ژنان ئاوا بکرێت. بەگونجاوترین شێوە دەشێ پارکی کولتووری ژنی ئازاد بێ. کاتێک خێزانەکان ناتوانن کچانیان بنێرنە بەرخوێندن، هەروەها بەهۆی بونیادە ناسراوەکانی خوێندگاکانی سیستەمیش، دەشێ پارکە کولتوورییەکانی ژنی ئازاد بۆ ئەو ژنان و کچانەی پێویستیان پێی هەیە، وەک ئەو گۆڕەپانانەی پەروەردە، بەرهەمهێنان و خزمەت لەخۆوەدەگرێت رۆڵی پەرستگا هاوچەرخەکانی ژنانیش ببینن.**

**دەڵێن ژیان بەبێ ژن نابێ. بەڵام ژیان لەگەڵ ژنی هەنووکەیشدا مەحاڵە. بەهەرحاڵ پەیوەندییەکی ژن ـ پیاو کە تاقورگ نقوومی ناو کۆیلایەتی بووە، پەیوەندییەکە مرۆڤ دەخاتە ناو زەڵکاوەوە. لەدۆخێکی وەهادا ئەوەی لەئەشقی راستەقینە چاوەڕواندەکرێ هێزی مەزن لەدەوروبەری ژنی ئازاد بخوڵقێنی و لەدوا گێژاوی سیستەمی سەرمایەداری رزگارمان بکات. پێویستە ئەمەش رەسەنترین و پیرۆزترین کارەکانی ئەو قارەمانە راستەقینانە بێ کەخولیای ئەشقن و سەریان لەپێناودا دادەنێن.**

### ١. رەگەزگەرایی لە هاتنەئارای پلەدارییەوە وەک ئایدلۆژی دەستەڵاداری واتای لێ بار کرا.

**بینینی ژن وەک رەگەزێکی مرۆڤیی کە جیاوازی بایۆلۆژی هەیە، لەسەرووی هۆکارەکانی نابینایی سەبارەت بە راستینەکانی کۆمەڵگا دێت. جیاوازی رەگەز بەتەنیا سەربەخۆ نابێتە هۆکاری هیچ کێشەیەکی کۆمەڵگا. هەروەکو چۆن دوالیزمی هیچ گەردیلەیەکی ناو هەبوونەکانی گەردوون وەک کێشە تاوتوێ ناکرێت، دوالیزمەکەی هەبوونی مرۆڤیش وەک کێشە نابینرێت. بەڵام ئەو وەڵامەی بدرێتەوە پرسیاری "بۆچی هەبوون و ژیان دوالیزمە؟" تەنیا دەشێت فەلسەفی بێت. دەشێت شیکاری ئۆنتۆلۆژی (زانستی هەبوون) لە وەڵامی ئەم پرسیارە (کێشە نییە) بگەڕێت. وەڵامی من بەم جۆرەیە: لەدەرەوەی دوالیزم، بەچەشنێکی دیکە هەبوون و ژیان نەدەبوو. دوالیزم شێوازی فەراهەمکردنی هەبوونە. ئەگەر ژن و پیاو لەدۆخی ئێستادا نەبن، تەنانەت ناتوخم (بێهاوتا) بن، لەم دوالیزمە رزگاریان نابێت. ئەمەیە ئەو بوویەرەی بەجووت رەگەزی (نێرەمووک) ناودەبرێت. پێویستە نەشلەژێین و سەرسوڕماو نەبین. بەڵام دوالیزمەکان بەردەوام مەیلیان بەلای دروستکردنی جیاوازییەوەیە. هەروەها لەم مەیلە دوالیزمەدا دەتوانرێت بەدوای بەڵگەی ژێری رەهای گەردوون (geist)دا بگەڕێن. هەردووڵایەنی دوالیزم نەباش، نەخراپن: تەنیا لەیەکتر جیاوازن، ناچارن جیاواز بن. ئەگەر دوالیزمەکان وەک یەکتریان لێبێت، هەبوون فەراهەم نابێت. بۆ نموونە: لەرێگای دوو ژن بەیەکەوە، یان دوو پیاو کێشەی زۆربوونی هەبوونی کۆمەڵگا شیکار ناکرێت. لەم سۆنگەیەوە پرسیاری" بۆچی ژن یاخود پیاو؟" بێبەهایە یاخود هەر بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا بگەڕێین، دەتوانرێت وەڵامێکی فەلسەفی بەم جۆرەی بدرێتەوە، گەردوون ناچارە ( ئارەزووی وەهایە، مەیلی وەهایە، ئەقڵی وا دەخوازێت) بەمجۆرە پێکبێت.**

**لەم چوارچێوەیەدا لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنی ژن وەک چڕبوونەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، تەنیا واتادارنییە، بەڵکو سەبارەت بە شیکارکردن و تێپەڕکردنی گرێکوێرەکانی کۆمەڵگاش بایەخێکی مەزنی هەیە. لەبەرئەوەی روانگەی پیاوسالاری جۆرێک لە لێخۆشبوونی بەدەستهێناوە، شکاندنی ئەو نابینابییەی سەبارەت بە ژن لە ئارادایە، بە واتایەک لە واتاکان هاوشێوەی پارچەکردنی ئەتۆمە. بۆ شکاندنی ئەم کوێرایەتییەش پێویستی بە هەوڵێکی گەورەی رۆشنبیری و رووخاندنی پیاوێتی باڵادەست**

**هەیە. هەرچی لەبەرەی ژندایە، بەو رادەیەی شیکارکردنی ئەو ژنە پێویستە کە لەبنەڕەتدا بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی ئاواکراوە، تەنانەت کردوویەتی بە شێوازی هەبوونی خۆی، لە هەمانکاتدا رووخاندنیشی پێویستە. ئەو بێئومێدی ( پراکتیزەنەبوونی ئۆتۆپیا، بەرنامە و پرەنسیپەکان)یەی لەسەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی تەواوی تێکۆشانەکانی ئازادی، یەکسانی، دیموکراتی، ئەخلاقی، سیاسی و چینایەتییەکان جێگای باسە، شوێنپەنجەی شێوەی پەیوەندی (نێوان ژن و پیاو) باڵادەستی (دەسەڵاتداری) لەخۆوە دەگرێت کە نەشکێنراوە. ئەو پەیوەندییانەی تەواوی نایەکسانی، کۆیلایەتی، ستەمکار، فاشیست و میلیتاریستەکان تێر خۆراک دەکات، سەرچاوەی بنەڕەتی خۆی لەم شێوەیەی پەیوەندی وەردەگرێت. ئەگەر خوازیارین ئەو لایەنە پەسەند و ماقوڵانە لە زاراوەکانی یەکسانی، ئازادی، دیموکراسی و سۆسیالیزم باربکەین کە بێ هیوایی ناخوڵقێنێت، پێویستە تۆڕی ئەو پەیوەندییانە شیکار و پارچەپارچە بکەین کە لەدەوروبەری ژن چێنراوە و هێندەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا ـ سروشت کۆنە. جگە لەمە هیچ رێگایەکی دیکە بەرەو دیموکراسی، یەکسانی و ئازادییەکی راستەقینە و ئەخلاقێکی دوور لە دووڕوویی ناچێت.**

**لەسەردەمی سەرهەڵدانی پلەدارییەوە واتای ئایدیۆلۆژیای دەسەڵات لە رەگەزگەرایی بارکراوە. ئەمەش لەنزیکەوە گرێدراوی جیابوونەوەی چینایەتی و دەسەڵاتدارێتییە. تەواوی لێتوێژینەوە شوێنەوارناسی، ئەنترۆپۆلۆژی و تێڕوانینە هەنووکەییەکان پیشاندەدەن کەقۆناخێک هەبووە ژن سەرچاوەی کاریگەری (دەسەڵات)بووە و ئەم قۆناخانەش درێژخایەن بوون. ئەم کاریگەرییە، کاریگەری ئەو دەسەڵاتە نییە کە لەسەر زێدە ـ بەرهەم ئاواکراوە، بەپێچەوانەوە کاریگەرییەکە سەرچاوەی خۆی لە سوودبەخشی و وەچەخستنەوە (زاوزێ) و هێزەکانی هەبوون (ژیان) وەردەگرێت. ژێری سۆزداری کە کاریگەرییەکەی لە ژندا زیاترە، رایەڵەی بەهێزی لەگەڵ ئەم ئافراندن (هەبوون)ە دا هەیە. بەشێوەیەکی زەق و بەرچاو جێنەگرتنی ژن لەناو شەڕەکانی ئەو دەسەڵاتەی لەسەر زێدە ـ بەرهەم ئاواکراوە، هەروەها شێوازی هەبوونە کۆمەڵایەتیەکەشی پەیوەندییان بەم پێگەیەیەوە هەیە.**

**دۆزینەوە مێژوویی و تێبینییە هەنووکەییەکان روونیدەکەنەوە کە پیاو رۆڵی پیشەنگایەتی پەرەپێدانی دەسەڵاتی گرێدراو بە سیستەمی دەوڵەتی و پلەداری بینیوە. لەم پێناوەشدا پێویستی بەتێپەڕاندن و شکاندنی کاریگەری ژن هەبوو، کە تا دوا قۆناخی کۆمەڵگای نیولیتیک بەهێزبوو. دیسان دۆزینەوە مێژوویی و چاودێرییە رۆژانەییەکانمان دەیسەلمێنن کە لەم بارەیەوە تێکۆشانی درێژخایەن، هەمەلایەن و مەزن ئەنجامدراوە. بەتایبەتیش میتۆلۆژیای سۆمەر کە وەک یادگای مێژوو و سروشتی کۆمەڵایەتییە لەم لایەنەوە تابلێی رۆشنکەرەوەیە.**

**مێژووی شارستانی لەهەمانکاتدا مێژووی دۆڕاندن و ونبوونی ژنیشە. ئەم مێژووە بە خوداوەند و بەندەکانییەوە، حوکمڕان و رەعییەکانییەوە، ئابووری، زانست و هونەرەکەیەوە مێژووی پتەوبوونی کەسایەتی پیاوی دەسەڵاتدارە. لەم سۆنگەیەوە دۆڕاندن و ونبوونی ژن، بەناوی کۆمەڵگاوە کەوتن و دۆڕانێکی مەزنە. کۆمەڵگای رەگەزگەرا بەرئەنجامی ئەم کەوتن و دۆڕاندنەیە. پیاوی رەگەزپەرست کاتێک فەرمانڕەوایەتی کۆمەڵایەتی خۆی لەسەر ژن ئاوا کرد، هێندە ئارەزوومەندە کە هەمووجۆرە پەیوەندییەکی سروشتی دەکات بە نمایشێکی باڵادەستی. دیاردەیەکی بایۆلۆژی وەک پەیوەندی زایەندی بەردەوام پەیوەندی دەسەڵاتی لێ بارکراوە. هیچ کاتێک لەبیر ناکات کە لە دۆخی سەرکەوتن بەسەر ژندا پەیوەندی زایەندی ئەنجامداوە. لەم لایەنەوە خوو و راهاتنێکی بەهێزی ئاواکردووە. چەندین پەند و گوتەی لەم بارەوە داهێناوە، چەندین چیرۆک و وشەی وەک "خراپم کرد"، " ئیشیم تەواوکرد"، "ماچە (حولحولی)"، "جاشولکە لە سکی و قامچی لەسەر پشتی کەم مەکە!"، "لەشفرۆشی، قەحپە"، " کوڕێکی کچانە"، " ئەگەر کچەکەت سەربەست کەیت یان رادەکاتە لای دەهۆڵچی یان زوڕنا ژن"، "زوو سەری گرێدە" باس دەکرێت. زۆر ئاشکرایە کە پەیوەندی زایەندی و دەسەڵات چۆن و تا چ رادەیەک لەناو کۆمەڵگا بەکاریگەرە. راستییەکی سۆسیۆلۆژییە کە لە رۆژی ئەمڕۆشماندا "مافی کوشتن"یشی لەناودا، هەر پیاوێک خاوەن مافێکی بێ سنوورە لەسەر ژن. ئەم "ماف"انە رۆژانە جێبەجێدەکرێن. پەیوەندییەکان زیاتر کارەکتەری دەست بۆ بردن و لاقەکردنی هەیە.**

**لە چوارچێوەی ئەم روانگە کۆمەڵایەتییەدا خێزان وەک دەوڵەتە بچووکەکەی پیاو ئاواکراوە. بە درێژایی مێژووی شارستانی بەردەوام تۆکمەکردن و بەکاریگەرکردنی شێوازی کامڵکردنی ئەو دەزگایەی خێزانی پێدەڵێن، هۆکارەکەی بۆ ئەو هێزە گەورەیە**

**دەگەڕێتەوە کە بە ئامێرەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی دەگەیەنێت. یەکەمیان؛ خێزان لەلایەن پیاوەوە دەکرێت بەدەسەڵات و بۆ خانەیەکی کۆمەڵگای دەوڵەت وەردەچەرخێنرێت. دووەمیان؛ کارکردنی بێ سنوور و بێ بەرامبەری ژن دەخاتە ژێر گەرەنتییەوە. سێیەمیان؛ منداڵ بەخێو دەکات و پێویستییەکانی ژمارەی دانیشتوان فەراهەم دەکات. چوارەمیان؛ وەک مۆدێلی رۆڵ بینین، ئاڵوودەبوون و کۆیلایەتی لەناوتەواوی کۆمەڵگادا بڵاودەکاتەوە. بەم ناوەڕۆکەیەوە لە راستیدا خێزان ئایدیۆلۆژیایەکە. ئەو دەزگایەیە کە ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتی تێیدا چالاک بووە. لەهەر خێزانێکدا پیاو خۆی بەخاوەنی خانەدانێک دادەنێت. ئەم ئایدیۆلۆژیایەی خانەدانێتی زۆر بەکاریگەرە لەوەی وەک راستینەیەکی گرنگ دەرک بەخێزان بکرێت. خێزانێک چەندە ژمارەی ژن و منداڵەکانی زیاد بێت، پیاو بەوڕادەیە سەربەرزە و دڵنیایە. بەم دۆخەی ئێستایەوە هەڵسەنگاندنی خێزان وەک دەزگایەکی ئایدیۆلۆژی بایەخدارە. بەم رەوشەی ئێستایەوە ژن و خێزان لەژێر سیستەمی شارستانی، واتە لەژێر دەسەڵات و دەوڵەت بکێشنەوە، بەناوی سیستەمەوە شتێکی زۆرکەم دەمێنێتەوە. بەڵام باجەکەی ئەم شێوازە، شێوازی هەبوونێکی ناکۆتای ژنە کە لەژێر ئازار، هەژاری، ئاڵوودە و دۆڕاوی دۆخی شەرێکی بەردەوامی چرو ئاست نزمی ئاشکراو راگەیەنراودا دەناڵێنێت. "پاوانی پیاو" کە وەک زنجیرەی دووەمی پاوان بەسەر جیهانی ژندا سەپێنراوە، وەک بڵێی هاوشێوە و هاوتەریبی پاوانەکانی سەرمایەیە کە بە درێژایی مێژووی شارستانی لەسەر کۆمەڵگا بەرێوەیان بردووە. لەهەمانکاتدا کۆنترین و بەهێزترین پاوانێتی. لەم خاڵەوە هەڵسەنگاندنی هەبوون (ژیانی)ی ژن وەک کۆنترین جیهانی داگیرکراو بەرەو ئەنجامی راست و واقیعیترمان دەبات. ئەگەر لەبارەیانەوە بڵێین: کۆنترین گەلی کۆڵۆنیکراو کە نەبووە بە میللەت (ئوممەت) راستترە.**

**دەبێت زۆر باش دەرک بە خەسڵەتێکی خانەدانێتی بکرێت، کە تایبەتمەندییەکە لە نزیکەوە رۆژگاری ئەمرۆشمان پەیوەندیدار دەکات: بنەماڵەگەرێتی و بوونی بە خاوەن ژمارەیەکی زۆری کوڕان، بەردی بناخەی ئایدیۆلۆژی خانەدانە. فرەژنی و داخوازی بەردەوامیان بۆ ئەوەی کوڕی زۆریان هەبێت، داخوازی سەرەکی ئایدیۆلۆژیای خانەدانە. هۆکاری ئەمەش هێزی سیاسییە. هەر وەکو چۆن راهیب لە میانەی پشت بەستن بە هێزی "واتا" پێشەنگایەتی کرد. کەسی بەهێزی خانەدان (بنەماڵە)یش لە رێگای پشت بەستن بە هێزی "سیاسی" رۆڵی پێشەنگایەتی دەبینێت. کاتێک گوێڕایەڵی هێزی سیاسی نەکرێت توندوتیژی بەکاردێنێت. هەرچی هێزی راهیبە کاتێک گوێڕایەڵی نەکرێت، هێزێکی مەعنەوی لە جۆری "غەزەبی خوداوەند" رۆڵی ئاگادارکردنەوە دەبینێت. سەرچاوەی سەرەکی هێزی سیاسی "دارودەستەی سەربازی پیاوە بەهێزەکەیە". لە سەردەمی پێشووتری نێچیرڤانی، بە تایبەتی لەو قۆناخەی دایک ـ ژن تێیدا بە کاریگەربوو پیاو سنووردار کراوە.**

**بە کورتی بۆ تێگەیشتن لەم دیاردەیە، پێویستە دەرک بە سیستەمی دایک ـ ژن و راستینەی خێزان بکرێت. لە سیستەمی دایک ـ ژندا مێرد یان دیار نییە یاخود زۆر لاوازە. دایک ـ ژن کاتێک منداڵی دەبێت، ئەو ئافرەتە نییە " لەگەڵ ئەو پیاوەی خۆشی دەوێت ئەشقبازی بکات". هێشتا ئەشق و کۆمەڵگای رەگەزپەرستی لە رۆژەڤدا نییە. ئافرەت بە پەیوەندی ژن و مێردایەتی گرێدراوی هیچ پیاوێک نییە. پیاویش لە دۆخێکی وەهادا نییە کە بالادەستی بەسەر ئافرەتدا ئاوا بکات و بڵێت "ژنی منی". نێچیروانی کارێکە خەریکی دەکات، جا کاتێک بەرهەمەکەشی کەم بێت بەهاکەی نازانرێت. رەوشێکی وەها لەناو کۆمەڵگادا پێش نەکەوتووە کە منداڵەکان بە هی پیاو ببینێت. منداڵەکان هی دایک ـ ژنە. وەکو پێویستییەکی سروشتەکەی شتێکی لەم جۆرە جێگای باس نییە کە دایک ـ ژن بە دوای شەهوەتدا رابکات، بۆ چێژ وەرگرتن بە دوای جووت بوونی زایەندیدا بگەڕێت. وەکو زیندەوەرەکانی دیکە زایەند لای ئەویش بابەتێکە. پەیوەندییەکی زایەندی بە ئامانجی زۆربوون جێگای باسە. رەنجدان و زەحمەتکێشان لەپێناو منداڵەکانیدا، هۆکاری سەرەکی گەڕانەوەی منداڵە بۆ سەر دایک ـ ژن. هەم لە دایکبوون هەم بەخێوکردنی منداڵان ئەو مافەی دەداتێ. هەر بۆیە لە قۆناخێکدا کە دیاربوون و دیار نەبوونی باوک هیچ واتایەکی کۆمەڵایەتی نەبووە، باسکردنی مافی باوک شتێکی بێ واتایە. بەڵام براکانی دایک ـ ژن گرنگن. چونکە لەگەڵ ئەوانەدا گەورە بووە. خاڵ و پور هێزی خۆیان لەم حقوقە کۆنەی دایک ـ ژنەوە وەردەگرن. کەواتە خێزانی دایک ـ ژن لە خاڵ، پور ـ گەر هەبێت منداڵی ئەوانیش ـ و منداڵەکانی خۆی پێکدێت. ئەو باسەی خێزانی دایکسالاری پێدەگوترێت گوزارشت لەم لایەنە دەکات. دەشێت بەم جۆرە گوزارشتی کۆمەڵایەتیانەی باوەڕی خوداوەندە ژن شرۆڤە بکرێت کە سەرچاوەکەی دایک ـ ژنی بەردی بناخەی نیولیتیکە. جگە لە خاڵەکان پیاو بوونی نییە. مێردایەتی و باوکێتی دانەهێنراوە.**

**خانەدانێتی وەکو ئایدیۆلۆژیا و کردار لە دەرئەنجامی سەراوژێربوونی ئەم سیستەمە (سیستەمی ژن) پێش دەکەوێت. بەڕێوەبەرایەتی ئەم سیستەمە کە دەکرێت بە پیاوسالاریش ناوی ببەین لە ئەنجامی ڕێکەوتن و هاوپەیمانی نێوان پیاوی بە تەمەن، دارودەستەی سەربازی پیاوە بەهێزەکان و شامانەوە ریشەی خۆی دادەکوتێت.**

**پێویستە سیستەمی خانەدانێتی وەک پێکهاتەیەکی یەکپارچەدەرکی پێبکرێت کەبونیاد و ئایدیۆلۆژی تێدا تێکەڵ بەیەکتری بوون. لەگەڵ ئەوەی خانەدانێتی لەناو خودی سیستەمی تیرە دەرکەوتووە بەلام مانای نکوڵیکردنەلەتیرەو بەسیفەتی دەستەبژێری بنەماڵەی چینی سەروو خۆی بونیاد دەنێت. خاوەن پلەدارییەکی زۆر وشکە. چینی بالادەستی بەرایییە. شێوەی بەرایی دەسەلات و دەوڵەتە. پشت بەبنەمای پیاو و منداڵی نێر دەبەستێت. بوون بەخاوەن ژمارەیەکی زۆری کوڕ بۆ دەسەلاتەکەی گرنگ و بایەخدارە. ئەم ئارەزووەش ڕێگای لەپێش سیستەمی فرەژنی، ژیانی حەرەمسەرا و کەنیزەکی کردۆتەوە. ئەگەر هەندێک لە پیاوان خاوەن دەیان ژن و سەدان منداڵن ئەوە گرێدراوی ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتی یە. دەسەلات و دەوڵەت سەرەتا لەناو خانەدان دەئافرێنرێت. گرنگرینیشیان خانەدان ئەو دەزگایەیەسەرەتا تیرەو خێڵی خۆی و سیستەمی تیرەکانی دیکەی دۆگری یەکەمین جیابوونەوەی چینایەتی و کۆیلایەتی کرد. لەشارستانی خۆرهەلاتی ناویندا بینینی دەسەلات و دەوڵەتێکی بێخانەدان وەک بڵێی مەحاڵە. بەهۆی ریشەداربوونی واقیعی خانەدان و بوونی بەپێگەی قوتابخانەی ئامادەکاری دەسەلات ـ دەوڵەت دۆخەکەبەمجۆرەیە.**

**لەگەڵ گۆڕانی خانەدانێتی بۆ ئایدیۆلۆژیای فەرمی مۆرکی خۆی لەبونیاد و پێکهاتەی خێزانیش داوە، بەشێوەی "بنەماڵەگەرێتی" ڕێگای لەپێش ئایدیۆلۆژیایەکی خوارووتر کردۆتەوە. جیاوازی لەنێوان خێزان و خێزانێکی دیکەوەجێگای باسە. بەدرێژایی مێژوو و بەر لەمێژووش شێوەزۆر جیاوازەکانی بەیەکەوەبوونی ژن و پیاو لەئارادا بووە. بەتایبەتیش شێوەی خێزانی کلان(تیرەی بەرایی) زۆر بەربلاو بووەکەقورسایی ژنی پێوەدیاربووە. لەم چەشنەی خێزاندا پیاو ـ مێرد هێندەناناسرێت. خالان و منداڵەکان زۆر گرنگترن. جۆرێکی دیکەش ئەوەیانەکەپیاو، ژن تێیدا وەکو یەکن. بەپێچەوانەوەی مەزەندەکان ئەمجۆرەش بەشێوەیەکی بەربلاو لەمێژوودا جێگای باس بووە. سیستەمی خێزانی پیاوسالاری زۆر دواتر و بەشێوەی سێبەری سێیانەی خانەدانێتی ـ دەسەلات ـ دەوڵەت پەرەی پێدراوە. ئامانجی سەرەکیشی پێگەیاندنی ژنان و منداڵەکانێتی بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خانەدان، دەسەلات و دەوڵەتی چینەکانی سەروو و ئافراندنی کەسایەتیەکی ئاراستەکراو. بەرژەوەندی ئەم دەسەلات و دەوڵەتەبناخەی خێزانی فرەژنو فرەمنداڵ پێکدێنێت کەپێویست نییەو ڕێگا لەپێش کێشەی کۆمەلایەتی زۆر قورس دەکاتەوە. هاوشێوەی خانەدان هەر سەرۆک خێزانێک بوون بەخاوەن ژمارەیەکی زۆری ژن و منداڵ وەک مێزێک و گەرەنتی ژیان دەبینێت. زەنیەتی زاڵ بەسەر کۆمەڵگا بەردەوام ئەم لایەنەهاندەدات. لەڕاستیدا لەچارەسەرکردن زیاتر لەم ڕێگایەوەدەرگا لەبەردەم سەرجەم کێشەکۆمەلایەتیەکانیدا ئاوالا دەکات. پەیبردن بەو راستیەی کەئەم دۆخەپێویستی ئایدیۆلۆژیای فەرمییەو لەلایەن ئایینەوەپشتیوانی لێدەکرێت و خوازیاری تۆکمەکردنین، سەبارەت بەدەرککردن بەکێشەکۆمەلایەتیەکان گرنگ و بایەخدارە. کولتووری خانەدانێتی و بنەماڵەگەرێتی کەتا ئێستا لەکۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناویندا بەهێزە. بەهۆی داخوازی بەدەستهێنانی پشک لەدەسەلات و دەوڵەت، ئەو ژمارەزۆرەی دانیشتوان کەڕێگای لەپێش کردۆتەوەیەکێک لەسەرچاوەسەرەکیەکانی کێشەکانە. بەکەمزانینی ژنان، نەبوونی یەکسانی، بێپەروەردەیی منداڵان، شەڕەکانی ناو خێزان و کێشەی ناموس هەمووی گرێدراوی بنەماڵەگەرێتی یە. وەک بڵێی کرۆکیەکی بچووکی کێشەکانی ناو دەوڵەت و دەسەلات لەناو خێزاندا ئاواکراوە. لەو چوارچێوەیەشدا بۆ شیکارکردنی دەسەلات ـ دەوڵەت ـ چین و کۆمەڵگا شیکارکردنی خێزان مەرجە.**

**لە کولتووری عەرەبەکاندا ئەڵلا، لای هیندییەکان براهمان و چینییەکانیش تاوۆ، نوێنەرایەتی هەمان پشتێنە (نەوە)ی ئیلاهی دەکەن. قۆناخی هاوبەشی شارستانێتی و لێکچوونی کولتووری لەم قۆناخەدا، هەرە زێدە لەناولێنانی خوداوەندەکاندا خۆی پیشاندا کە هێمای سەرەکییە و نوێنەرایەتی کۆمەڵگا دەکات. وەک ناو هەموویان لە سالانی ٢٠٠٠پ.ز دا دەرکەوتوون، ئەمەش ڕێکەوت نییە. سەرچاوەی خۆی لەو کولتوورە هاوبەش و قووڵە وەردەگرێت کە بناخەکەیان پێکدێت. بەوشێوەیەی کراوە بە**

سیمبۆڵ کولتووری پیاوسالاری دەکرێتە ئیلاهی (دایک ـ ژن و ئابوورییەکەی ئیتر لەلایەن پیاوی فێلباز و زۆردارەوە زەوتدەکرێن).
ناوی سەرەکی دایکە ـ خوداوەند، بەزمانی ئاریانی ستار (ئەستێرە)، بە سۆمەری ئینانا، بە زمانی هیتیتی کیبەلە، زمانی سامی عەشتار و زمانی هیندیش کالی چەندەی دەچێت کز دەبێت، ئیتر ناوی خوداوەندە پیاوەکانی ئاماژەمان پێکرد شکۆدار دەکرێت.
لەگەڵ کشانەوەی ژن بۆ نهۆمی هەرە خوارەوەی کۆمەڵگا، لەسالانی ٢٠٠٠پ.ز لەرووی زمان و کولتووریشەوە شکستێکی مەزن و کەوتن جێگای باس دەبێت. لە کولتووری ماددی و مەعنەوی شارستانێتیدا کۆیلایەتی رەگەزی ژن لەپێش کۆیلایەتی تیرە و پیاوەوە دێت، لەڕاستیدا ژن لە قووڵترین ئاستی کۆیلایەتیدا بەدۆخێک گەیەنراوە کە تێکشکێنراوە، دەنگی کپ کراوە و هەناسەی لەبەر براوە، سووکایەتی پێکراوە، نەعلەتی لێکراوە و لەرەوشی بوونەوەرێکی مردوودایە. پیاو ـ مێردایەتی لەسەر زەمینەی ژنێتی و دەسەڵاتدارێتی بەسەر ژن بەرز دەبێتەوە. بەردەوامکردنی ئەم ستاتۆیەی ژن لای عەرەبەکان و ئەو کۆمەڵگایانەی لە رۆژهەڵاتی ناویندا خاوەن هەمان زەمینەی کولتوورین ئەم هەڵسەنگاندنە پشتڕاست دەکاتەوە. تاوانەکانی نامووس فاکتەرێکی بچووکی ئەم کولتوورەیە.

با لە رێگای نموونەیەکەوە رۆشنی بکەینەوە. کۆمەڵگا تەنیا ئەوە پەسەند دەکات کە ژنێک تەنیا بەپیاوێکەوە گرێدراو بێت و لەماڵەکەی خۆیدا بەشێوازێک بژیت کە بەشەرەفمەندانە دەناسرێت. کاتێک ژن لەم رەوشە دەردەچێت و چەندین پیاو بێنێتە ماڵەوە، یان بەپێچەوانەوە پیاو چەندین ژن بێنێتە ماڵەوە رەوش چۆن دەبێت؟ هەڵبەتە سەراوبن دەبێت. لە مەسەلەی پارەدا رەوشەکە ئاڵۆزتریشە. ئەگەر درێژە بەنموونەکەمان بدەین، لەبەرئەوەی ژن رێسای گشتی شکاندووە لە رێگای دەرکردنی لەماڵەوە ئەگەری گەیشتن بە رێگەچارەیەک هەیە، بەڵام لەمەسەلەی پارەدا لەوانەیە کارەکان هێندە ئاسان نەبن. ئەوەی پارەی بەدەستەوەیە، ئەگەر یەکێکی نەفس بەرز نەبێت، چەندە پارە بچێتە سەر پارەکانی، لەوانەیە پەسەندی بکات. کەچی هەروەکو مەسەلەی ژنەکە، کۆمەڵگا پارەی بۆ نێوەندکاری پەسەند نەکردووە. شیمانەیەکی بەهێز ئەوەیە کۆمەڵگا گووتوویەتی کۆکردنەوەی پارە گەورەترین بێ شەرەفییە.

کاتێک زیاتر لە نزیکەوە تەماشای کۆیلایەتی ئافرەت بکەین، لایەنی پلیشاندنەوە و دەرخستنی لە مرۆڤایەتی سەرنجمان رادەکێشێت. بەستنەوەی لەماڵدا، تەنیا زیندانی کردنێکی شوێن نییە. تەنانەت زیندانیش نییە. بە قووڵی گوزارشت لە بەستنەوەی بۆ لاقە کردنی دەکات. هێندەی دەخوازرێت با لە میانەی رێوڕەسمەکانی دەستگیرانی و بووکێنی هەوڵی شاردنەوەی راستییە قووڵەکە بدرێت، دیسان یەک رۆژ بۆ ئەو کەسانەی خۆیان دەناسن واتای کۆتایی هاتنی کەرامەتی مرۆڤە. ئافرەت لە میانەی ئامرازە هەمەڕەنگەکانی سیستەمی توندوتیژییەوە، لەویش زیاتر لە رێگای ئامرازەکانی داڕووخانی ئایدیۆلۆژییەوە ـ بە بابەتی ئەشقیشەوە ـ ئەوەندە لە بەهای هەزار ساڵییەکانی بەرهەم، پەروەردە، بەڕێوەبەرایەتی و ئازادیخوازی دوور دەخرێتەوە و بچووک دەکرێتەوە، کە ئەنجامەکەی لە رادەست بوون خراپترە. واتا بە تەواوی ناسنامەی خۆی لە دەستدەدات و بۆ "ژنێتی" دەگۆڕێت (مەبەست ژنی پیاوە). لەبەرچاوی پیاوێکی هەرە ئاسایی، تەنانەت لای شوانێکی چیاش ئافرەت تەنیا بۆ ژنێتی یە، دەتوانێت ببێتە ژنی پیاوێک. هەرچی ژنێتی یە بە واتای مافی هەموو جۆرە مامەڵە کردنێک دێت پێیەوە ـ تەنانەت بەوەشەوە کە هەر کاتێک بیەوێت، دەتوانێت بیکوژێت ـ. ئەو تەنیا موڵکێک نییە، بەڵکو موڵکێکی زۆر تایبەتە. بۆ خاوەنەکەشی پۆتانسیلی بوون بە ئیمپراتۆرێکی بچووک لەخۆوە دەگرێت، ئەگەر بزانێت بەکاری بێنێت!

هەرچی خاوەندارێتیکردنی ژنە، بوو بە زەمینەی یەکەمین هزری موڵکایەتی. دواتر هەنگاو بۆ بە کۆیلەکردنی پیاو هاوێشترا. لە سەردەمی شارستانیدا جۆری خێزانی فراوان و درێژخایەنی لە شێوەی خانەدانێتی دەبینین. بەڵام خێزانە لادێیی و پیشەکارە سادەکان لە هەموو کاتێکدا هەبوون. دەوڵەت و دەسەڵاتەکان کۆپییەیەکی دەسترۆیی خۆیان لەناو خێزاندا بە باوک ـ پیاو بەخشیوە و رۆڵێکی هاوشێوەی خۆیان پێداوە. بەمجۆرە خێزان کراوەتە گرنگترین ئامرازی مەشروعیەت پێدانی پاوانەکان. بەردەوام رۆڵی سەرچاوەی کۆیلە، جووتیار، کرێکار، رەنجدەر و سەرباز و تەواوی خزمەتەکانی دیکەی بۆ تۆڕەکانی سەرمایە و باڵادەستی بینیوە. لەبەر ئەم هۆکارە خێزان گرنگی پێدرا و پیرۆزکراوە. سەرباری ئەوەی تۆڕەکانی سەرمایەداری گرنگترین

سەرچاوەی قازانجی خۆیان لەسەر رەنجی ژن لەناو خێزاندا بەدەستدێنن، بەڵام ئەمە پەردەپۆش دەکەن و بارێکی زیادە دەخەنە سەر خێزانەوە، وەک بڵێی خێزان کراوەتە زامنی دڵنیایی سیستەم و بەمجۆرە مەحکومی دەمارگیرترین قۆناخی ژیانی کراوە.

رەخنەکردنی خێزان گرنگە. چونکە تەنیا لەسەر بنەمای رەخنەکردن دەتوانێت ببێتە فاکتەری کۆمەڵگای دیموکراتی. تا تەواوی خێزان ـ نەک تەنیا ژن (فێمێنیزم) ـ وەک خانەی دەسەڵات شیکار نەکرێت، ئەو ئایدیال و پراکتیزەکردنی شارستانێتی دیموکراتی لە گرنگترین فاکتەرەکانی بێبەشدەبێت. خێزان دامەزراوێکی کۆمەڵایەتی نییە کە تێپەڕ بکرێت. بەڵام دەتوانرێت وەرچەرخێنرێت. پێویستە دەستبەرداری بانگەشەکانی موڵکایەتی ژن و منداڵان بکرێت کە لە سەردەمی پلەدارێتی(پاارشی) یەوە ماوەتەوە، هەروەها پەیوەندی دەسەڵات و سەرمایەش (هەموو جۆرەکانی) لە پەیوەندییەکانی هاوسەرێتیدا رۆڵ نەبینێت. پێویستە هەڵوێستە رەمەکییەکانیشی بەلاوە بنرێت کە بە بیانووی بەردەوامکردنی جۆری مرۆڤ پەیرەو دەکرێت. نموونەییترین هەڵوێستی یەکێتی نێوان ژن و پیاو ئەوەیانە کە گرێدراو بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی فەلسەفەی ئازادی بە بنەما دەگرێت. ئەو خێزانەی لەم چوارچێوەیەدا بە وەرچەرخاندا تێپەڕبێت، دەبێتە تەندروستانەترین زامنی کۆمەڵگای دیموکراتی و یەکێک لە پەیوەندییە سەرەکییەکانی شارستانێتی دیموکراتی. لە هاوسەرێتی فەرمی زیاتر، هاوسەرێتی سروشتی گرنگە. بەڵام پێویستە هەموو کاتێک هەردوولا بۆ ژیانی جیاواز و بە تەنیاش ئامادەبن. ناکرێ بەشێوەی کۆیلایەتی یان کوێرانە لەماوەی پەیوەندیدا جموجۆڵ بکرێت. وەک ئاشکرایە لەژێر سایەی شارستانێتی دیموکراتیدا خێزان واتادارترین وەرچەرخان بەخۆیەوە دەبینێت. ژن کە بەشێکی زۆری لە رێزو قورسایی هەزاران ساڵەی خۆی لەدەستداوە، تا هێزو رێزێکی مەزن بە دەست نەهێنێتەوە، یەکینەی خێزانی واتادار پێشناکەوێت. ئەو خێزانەی لەسەر بنەمای جەهالەت و نەزانی ئاواکراوە، جێگای رێز نابێت. ئەو رۆڵە گرنگە کە لە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی شارستانێتی دیموکراتیدا دەکەوێتە سەر خێزان.

### ب. کۆمەڵگەی رەگەزگەرایی بە هێندەی سەرمایەداری جانەوەرێکی کۆمەڵایەتی مەترسیدارە.

بە درێژایی مێژوو رەگەز(گەرایی) پەرستی ئەو چەکە بووە کە هەرە زێدە لەلایەن سیستەمەکانی شارستانییەوە بەکارهێنراوە ( دژی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی). کۆڵۆنیکردنی ژن بۆ زۆر ئامانجی جۆراوجۆر بەکاربگەرترین نموونەی ئەم باسەیە. وەچەدەخاتەوە، کرێکاری بێ کرێیە، خاوەنی بە پەژارەترین و سەختترین کارە و گوێڕایەڵترین کۆیلەیە. هەروەها لەدۆخی ئۆبژەی هەمیشەییکردنی ئارەزووی زایەندیدایە. ئامرازی ریکلامە. بەنرخترین کاڵایە، بگرە شاژنی گشت کاڵاکانە. وەک ئامرازی لاقەکردنی بەردەوامی پیاو دیمەنی ئەو کارگەیە دەدات کە دەسەڵاتەکەی دەستبەر دەکات. وەک ئۆبژەی جوانی و رازانەوە لە بواری مەعنەوییەوە درێژەپێدەری کۆمەڵگای پیاوسالارییە. لەناو ئەو کۆمەڵگا پیاوسالارییەی لە بونیادی دەوڵەت ـ نەتەوەدا هەیە بەڕادەیەکی هەرە بەرز لەم لایەنانەوە ژن بەم پێگە داڕووخاوە دەگات. چونکە خەیاڵی (وێنا)ی ژن لە کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوە بە سیفەتی خوداوەند (وێنا و ناسنامەی هاوبەشی ژن) لە رووخساردا ئامراز و کەرەستەیەکی عیبادەتە. بەڵام سیفەتی خوداوەندە ژن "ئیلاهە" لێرەدا بە واتای سۆزانیخانە (ماڵی گشتی)و سووکایەتی پێکردن دێت. ژن بە سیفەتی ئیلاهە، ئەو ژنەیە کە هەرە زێدە دووچاری سووکایەتی پێکردن هاتووە و بچووک خراوە. لەکاتێکدا رەگەزپەرستی کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوە لەلایەکەوە بەشێوەیەکی زێدەڕۆ و لە بەرزترین ئاستدا پیاو دەکات بە دەسەڵاتدار، (هەر پیاوێکی باڵادەست بەشێوەیەکی داپۆشراو پەیوەندی زایەندی بەواتای "ئیشی قەحبەکەم تەواو کرد"،"توانیم (زاڵبووم)"لەمێشکیدا جێگیر دەکات) لەکەسایەتی ژندا کۆمەڵگا دەخاتە دۆخی کەوتووترین کۆڵۆنییەوە، لەم چوارچێوەیەدا لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا ژن لە دۆخی پێشکەوتووترین کۆڵۆنی نەتەوەی کۆمەڵگای مێژووییدایە!

یەکێک لەو کۆڵەکانەی شارستانییان ئامادە کردووە ئەم راستییە بووە. یەکێک لە جۆرەکانی سنوور نەناسی کولتووری ماددیش گرێدراوی ئەم راستییەیە. خواستویانە ئەو ئەزموونە سەرکەوتووەی بەرامبەر ئافرەت بە دەست هێنراوە، بۆ تەواوی کۆمەڵگای بگوازنەوە. ئەمە دووەمین هۆکاری ترسناک بووە. بۆ ئەفەندییەکان دەبوایە کۆمەڵگاش وەکو ژن رۆڵ ببینێت. دواتر هەوڵی روون کردنەوەی دەدەین کە چۆن تەواو کردنی بە ژنکردنی کۆمەڵگا لە سیستەمی سەرمایەداریدا ئەنجامدراوە. بەڵام بناخەی ئەم کردارە

له یەکەمین قۆناخی شارستانیدا دانراوە، هەرچی لە کولتووری گریک ـ رۆمادایە خوازراوە ئەمە وەکو نموونەی کۆمەڵگایەکی سەرکەوتوو پێشکەش بکرێت. تەنیا لە میانەی بە ژنکردنی پیاو دەتوانرێت باس لە بە ژنکردنی کۆمەڵگا بکرێت. کۆمەڵگای گریک ـ رۆما باش هەستی بەمە کردووە و تەگبیری وەرگرتووە. بابەتێکی زانراوە کە رەوشی کۆیلەکانی زۆر لە هی ئافرەت خراپتر بووە. کێشە بە ژنکردنی ئەو پیاوانە بوو کە کۆیلە نین. باس لە پەیوەندی زایەندی نێوان ئەندامانی خێزان، لادانی سێکسی و هاورەگەزبازی ناکەم. رەهەندی دەروونی، تەنانەت هۆکاری جەستەیی ئەو دیاردانەی کە باسیان دەکەم، پێویستە بە جیا هەڵسەنگێنرێت. بە گوێرەی مۆدێلی کۆمەڵگای کلاسیکی یۆنان، هەر کورە لاوێکی ئازاد مسۆگەر دەبێت خاوەنێک یان (هاوجووتێکی سێکسی) پیاوی هەبێت. تا لاوەکە دەبێتە خاوەن ئەزموون دەبێت خۆشەویستی هاوجووتە سێکسییەکەی بێت. هەر وەکو باسم کرد، تەنانەت سوقراتیش لەو بارەیەوە دەڵێت:"لەم رووداوەدا گرنگ زۆر بەکارهێنانی لاوەکە نییە، گرنگ ئەوەیە لەم دۆخە رۆحییەدا بژی". زهنییەتەکەی ئێرە زۆر ئاشکرایە. لەبەرئەوەی کۆمەڵگای کۆیلایەتی لەگەڵ پرەنسیپی کەرامەت و ئازادی هەڵی نەدەکرد، دەبوایە ئەم تایبەتمەندیانە لەناو کۆمەڵگادا بسڕدرێتەوە، چونکە هەرەشەیان لە کۆمەڵگای شارستانی دەکرد. راست بوو، شوێنێک ئازادی و کەرامەتی مرۆڤی لێبێت کۆیلایەتی تێیدا ناژی. سیستەم دەرکی بەمە کردووە و پێویستییەکانی جێبەجێ کرووە.

بێگومان کولتووری گریک ـ رۆما نەیتوانی ئەم رۆڵەی خۆی تەواو بکات. لە ناوەوە ئایینی کرستیانی کە لە میانەی قوتابخانە ئازادەکانی فەلسەفەوە پێشکەوت، لە دەرەوەش هێرش و راپەڕینە بەردەوامەکانی ئەتنیکەکان ئەم کۆمەڵگایەی رووبەڕووی رەوشێکی دیکە کردەوە. ئەو هێمایانەش کەم نەبوون کە دەیانگوت کولتووری ماددی هەموو شتێک نییە و هێزەکەی بارتەقای هەموو شتێک ناکات. بەڵام لە سەردەمی سەرمایەداریدا بە بێ ئەوەی پێویستی بە "نێربازی" ببینێت، دەیتوانی کۆمەڵگا بکات بە ژن!

سەرباری تەواوی رازاندنەوەکانی لیبرالیزم، وەک چۆن مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ستاتۆ کۆنەکەی بۆ یەکسانی و ئازادی نەگۆڕی، ئەرکی دیکەشی لێ بارکردووە و ژنی خستۆتە ژێر ستاتۆیەکەوە کە زۆر لەهی جاران قورسترە. ستاتۆکانی لەجۆری هەرزانترین کرێکار، کرێکاری ماڵەوە، کرێکاری بێ بەرامبەر، کرێکاری نەرم و خزمەتکاری پیشانیدەدات کە رەوشی قورستر بووە. لەسەر ئەمەشەوە بەکارهێنانی وەک ئامرازێکی ریکلام و کەرەستەیەکی مەگازنی راگەیاندن قووڵترکراوەتەوە. تەنانەت جەستەکەشی وەک ئامرازێکی هەمەلایەنی بەکارهێنان و فرۆشتنەوە کاڵایەکە سەرمایە دەستبەرداری نابێت. بەردەوام ئامرازی وروژاندن و هاندانی ریکلامکردنە. بەکورتی، بە بەرهەمترین نوێنەری کۆیلەی مۆدێرنە. ئایا دەتوانرێت بیر لە کاڵایەکی بەمجۆرە بکرێتەوە کە هەم لەو کۆیلەیە بەهادارترە کە زۆرترین قازانج بەدەست دێنێت، هەم ئامرازێکی ئارەزووە ناکۆتاکانە؟

ئامانجی رەگەزگەراییش هەناسەبڕکردنی ژنە. ئەرکی کاراو بەکاریگەری ئایدیۆلۆژیای رەگەزگەرایی؛ تێوەگلانی پیاو بەنەخۆشی دەسەڵات و سەپاندنی دەستی دەستدرێژییەبەسەر ژندا. لەکاتێکدا لەمیانەی زانستگەرایی پۆزێتیڤیستەوەدونیای ئەکادیمی و لاوان بێکاریگەر دەکات و جگەلەئاوێتەبوون لەگەڵ سیستەمدا بژارێکی دیکەیان بۆ ناهێڵێتەوە، لەبەرامبەر هەندێک سازشدا ئاوێتەبوونەکەگەرەنتی دەکات.

دوای کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند دووەمین دامەزراوەی کۆمەڵایەتی گرنگ کەلەسەردەمی سەرمایەداری پیشەسازی دووچاری پەرتەوازەبوون بووەخێزانو ژنە. بابەتێکی دیکەی گرنگ کەسۆسیۆلۆژیای رۆژئاوا پەردەپۆشی کردووەدیسان خێزان و ژنە. خۆی لەروونکردنەوەی هۆکارو چۆنیەتی بوویەری رووخانی خێزان دەدزێتەوە. هەروەها هەلومەرجی ماددی دامەزراوەی خێزان کەلەکۆمەڵگای شارستانی بۆتەرەوشێکی نەریتی باو، بەهۆی زیادبوونی بێکاریو گەندەڵییەوەتارادەیەکی مەزن لەناو دەچێت. بەمجۆرەخێزان هیچ مانایەکی کۆمەڵایەتی نامێنێت. کاتێک تاک لەکۆمەڵگا دادەبڕێنرێت، ئەو پشکەی لەم بابەتەدا دەبێتەبەشی ژن فرێدانەکۆلان، رادەستبوونی بەپیاوی باڵادەستەکەبەشێوەیەکی زۆردارانەهەلومەرجێکی ناکۆک بەسروشتەکەی بەسەردا دەسەپێنێت. واتەهەروەکو پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێت لەو سەردەمەدا کۆیلایەتی ژن کۆتایی نەهاتووەو ژن ئازادی خۆی بەدەست

نەهێناوە. چونکەکۆیلایەتی ژن لەسەردەمی سەرمایەداریدا کۆیلایەتی بازارە؛ هێندەقووڵەتەنانەت گشت خانەو پێکهاتەکانی جەستەی دەکرێن بەکاڵا. یەکێک لەفاکتەرەگرنگەکانی قەیرانی ئیندوستریالیزم لەسەر خێزانو ژندا جێگای باسە. نەک تەنیا زیادبوونی بەردەوامی دۆخی تەڵاقو منداڵانی شەقام، بەڵکو چەوساندنەوەو دەسەڵاتگەرایی سنوورنەناسی رەگەزگەرایی کۆمەڵگا قووڵایی ئەو داڕووخانو قەیرانەدەخەنەڕوو. بەو سیفەتەی کێشەی ژنو خێزان لەکۆمەڵگاداو ەەروەەا چارەسەرکردنیان سەرەکیترین فاکتەرەکانی ژیانی ئازادن، لەبواری تیۆریو کرداریەوەپێویستییان بەهەوڵو کۆششێکی مەزن هەیە.

لیبڕالیزم کە کۆمەڵگای رەگەزگەرایی دەور وەرگرت، تەنیا بەوە نەوەستا کە لەماڵەوە ژن بکات بە کرێکاری بێ کرێ. بەڵکو لەمەش زیاتر لەمیانەی کردنی بە ئۆبژەی زایەند و وەک کاڵایەک پێشکەشکردنی لە بازاڕدا، قازانجی زیاتری بەدەستهێنا. لەکاتێکدا پیاو تەنیا رەنجەکەی دەکرێت بە کاڵا، ژن بەهەموو جەستەیەوە کرا بەکاڵا. لەراستیدا بەمجۆرە مەترسیدارترین شێوەی کۆیلایەتی ئاوادەکرا. ئەگەر "ژنی مێردەکەی" سیفەتێکی باشیش نەبێت، دەبێتە بابەتی قۆستنەوەیەکی سنووردار. بەڵام کاتێک بەهەموو کەسایەتیەکەیەوە دەکرێت بەکاڵا، بە واتای کۆیلایەتییەک دێت لە کۆیلایەتی سەردەمی فیرعەونەکان خراپترە. چونکە کرانەوە بۆ کۆیلایەتی هەر کەسێک، چەندین جار لە کۆیلایەتی دەوڵەتیک یاخود کەسێک مەترسیدارترە. ئەمە ئەو تەڵەزگەیە کە مۆدێرنیتە بۆ ژنی داناوەتەوە. ئەو ژنەی لە رەواڵەتدا بۆ ئازادی کراوەیە، کەوتبووە دۆخی ریسواترین ئامرازی قۆستنەوە. لەئامرازێتی ریکلامەوە تا دەگاتە ئامرازی سێکس و پۆرنۆ، ژن سەرەکیترین ئامرازی قۆستنەوەیە. بەدڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم لە گواستنەوەی سەرمایەداریدا ژن خراوەتە ژێر قورسترین بارەوە.

پیاو بەو سیفەتەی نوێنەری دەوڵەتە لەناو خێزاندا، خۆی بە بەرپرسیار و خاوەن کاریگەری دەبینێت سەبارەت بە پێشخستنی چەوسانەوە و دەسەڵات بەسەر ژنەوە. لەمیانەی بەربڵاوکردنی فشاری باوی سەر ژن، هەر پیاوێک دەکرێت بە بەشێکی دەسەڵات. لەم رێگایەوە کۆمەڵگا دەکەوێتە ناو نەخۆشی گرێکوێرەی گەیشتن بە بەرزترین ئاستی دەسەڵاتەوە. ستاتۆی ژن سۆز و هزری بێ سنووری دەسەڵات بە کۆمەڵگای پیاوسالاری دەبەخشێت. لەلایەکی دیکەشەوە لە پێکهاتنی کرێکاری سازشکارەوە تا بێکار، کرێکاری بێکرێ تا دەگاتە کەمترین کرێ، ئەوەی لە هەر خراپەکاریەکدا باجی لێدەبڕێت ژنە رەنجدەرەکانن، خودی ژنە. ئایدیۆلۆژیای رەگەزگەرایی لیبڕالیزمی پێکەوە لکێنراو، تەنیا بەچەواشەکردن و شێواندنی ئەم رەوشە و پیشاندانی بەجۆرێکی ترەوە ناوەستێت، هەروەها بۆ ئەو کەناڵە ئایدیۆلۆژییانە وەردەچەرخێنرێت کە تایبەت بۆ ژنان پێشخراوە. شتێکە لە جۆری: بەدەستی خۆی کۆیلایەتییەکەی پەسەند و هەرس بکات. دەتوانرێت بگووترێت، کاتێک لەبواری ماددی و ئایدیۆلۆژییەوە سیستەم ژن دەقۆزێتەوە و بەکاری دێنێت، تەنیا قورسترین قەیرانەکانی تێپەڕ ناکات، بەڵکو هەبوونی خۆشی فەراهەم دەکات و دەخاتە ژێر گەرەنتییەوە. ژن لە پێگەی کۆنترین و نوێترین نەتەوەی کۆڵۆنیکراوی مێژووی شارستانی بەگشتی و مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدایە. ئەگەر لەهەر لایەکەوە دۆخی قەیرانێک جێگای باسە کە چیتر دەرفەتی بەردەوامبوون لە ئارادا نامێنێت، ئەوا بەشی کۆڵۆنیکردنی ژن لەسەرووی هۆکارەکانی ئەم دۆخەوە دێت.

پێویستە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا ئاماژەی پێبکەم، بەبڕوای من شیکارەکانی سەبارەت بە رەگەزگەرایی کۆمەڵگا پۆزیتیڤیستن، باوەڕناکەم لەرێگای مەڵوێستە ئۆبژەکتیڤیتە قەبەکانەوە بتوانین ژن شیکار بکەین. بەتایبەتیش لەکۆدەکانی ئەو کۆیلایەتییە بێئاگاین کە دەرخواردی ژن دراوە. لەو بڕوایەدام لە رادەبەدەر لەزهنیەتی فالوس ـ ڤاجینا گلێنراوە، ئەو زهنیەتەش تواناو بەهرەکانی دیکەی مرۆڤی سەقەت کردووە. لەم بارەیەوەخاڵی سەرنجڕاکێشی لێرەدایە؛ دیاردەی جووتبوونی زایەندی کەلەدونیای سەرجەم رووەک و ئاژەڵاندا رۆڵێکی مانادار، شێوەو ماوەیەکی دیاریکراوی هەیە، بەڵام لەجۆری مرۆڤدا بۆ ماوەیەکی بێسنوور بڵاوبۆتەوە، لەبواری شێوەو رۆڵیشەوەبەدۆخێکی زۆر خراپ و ناڕەسەن گەیشتووە. مسۆگەرەکەئەو ناڕەسەنییەسەرچاوەی خۆی لەدۆخی کۆمەڵگا وەردەگرێت. بەمانایەکی تر دەتوانین بڵێین لەگەڵ سەرهەڵدان و بەگشتیبوونی کێشەی کۆمەڵگا (سەرکوتکردن و چەوسانەوە) پەرەی سەندووە. دەستنیشانکردنی ئەو راستییەی کە؛ کێشەی ژن کێشەیەکی سەرەکی کۆمەڵگایەو سەرچاوەی خۆی لەهەڵوەشاندنەوەی هەمەلایەنەی کۆمەڵگای دایکانەوەردەگرێت بۆ ئەنجامدانی پێناسەیەکی راست پێویستە.

ڕەگەزگەرایی کۆمەڵگاش بەلانی کەم بەقەدەر سەرمایەداری جانەوەرێکی کۆمەڵایەتی مەترسیدارە. چەندەجێگای داخەکەبەئامانجی بەربەستکردنو شاردنەوەی حەقیقەتی ئەو دیاردەیە باڵادەستی پیاوی فێڵبازو بێرەحم هەڵوێستێکی چاوسوورو زۆردارانە پیشاندەدات. سەرەڕای ئەوەی بەقەدەر سەرمایەداری پێویستی بەلێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوەهەیە، بەڵام ڕەگەزگەرایی ئەو بوارە کۆمەڵایەتیەیە کە لە ناو تاریکیدا بەشاراوەیی هێڵراوەتەوە. هەڵوێستو ڕەفتارە ڕەگەزگەراییەکان یەکەمین سەرچاوەی گشت ئایدیۆلۆژیاکانی دەسەڵاتو دەوڵەت پێکدێنن. ئەو بوارە کۆمەڵایەتییەی کەقووڵترین و داپۆشراوترین جۆری کۆیلایەتی، چەوسانەوەو سەرکوتکردنی لەسەر پەیڕەو دەکرێت کۆیلایەتی ژنە. ئەو تۆێژەکۆمەڵایەتیەیەکەسەرجەم شێوەکانی دەسەڵاتو دەوڵەتی لەسەر تاقیکراوەتەوە.

سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوە کە بە هۆشیاریەکی قووڵی تێگەیشتنی ئەم تایبەتمەندێتیانەی کۆمەڵایەتی ژن دەجووڵێنەوە، گرنگیو بایەخێکی زۆر بە بەرکارهێنانی ژن دەدەن بەو سیفەتەی لەپێشترین ئامرازی سەرمایەو دەسەڵاتە. هەربۆیە پێویستە زۆر بەباشی بزانرێت ئەگەر کۆیلایەتی ژن نەبێت ئەوا هیچ جۆرێکی کۆیلایەتی چانسو دەرفەتی پەرەسەندنو ژیانی نابێت. سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوەگوزارشت لەو پیاوەدەسەڵاتدارەدەکەن کەلەئاستێکی بەرزدا بووە بە داموەزگا. ڕاشکاوانەتر بیڵێین سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوەپاوانی پیاوی زۆردارو چەوسێنەرە. پارچەکردنی ئەم پاوانەلەوانەیەلەپارچەکردنی ئەتۆم زەحمەتتر بێت.

بەو سیفەتەی دیموگرافیا (زانستی دانیشتوان) باڵێکی لاوەکی ڕەگەزگەرایی کۆمەڵگایە بەیەکەوە لەگەڵ مۆدێرنیتە بە مەبەستی ئاواکردنی سوپای سەربازی، سوپای بێکارانو کۆمەڵگای نەتەوەی ستاندار ئاماریش بەکاردێننو زاوزێی ژنان بەپێوانەی مێژوویی دەبەستنەوە. ئەو ئایدیۆلۆژیایەی بەماڵتۆسگەرایی ناو دەبرێت گوزارشت لەو ڕەوشەدەکات. زیادبوونی ڕادەبەدەری ژمارەی دانیشتوان کە هەڕەشە لە کۆمەڵگاو ژینگە دەکات لەگەوههەری خۆیدا کێشەیەکی بایۆلۆژی نییە، بەڵکو ئەنجامێکی قۆستنەوەی ئایدیۆلۆژیای ڕەگەزگەراییەلەلایەن سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوەوە. خێزانگەرایی مۆدێرنیشی لەناودا ئایدیۆلۆژیای ڕەگەزگەراییو کردەوەکانی سەرمایەداریو دەوڵەت ـ نەتەوەلەوانەیەبۆ کۆمەڵگاو ژینگە گەورەترین سەرچاوەی کێشەبن. گرێدراو بەدەوڵەت ـ نەتەوەپێویستەڕەگەزگەرایی کۆمەڵگا وەک پێنجەمین گەورەسەرچاوەی کێشەی کۆمەڵایەتی هەڵسەنگێنرێت.

کێشەی دانیشتوان لەنزیکەوە گرێدراوی ڕەگەزگەرایی، خێزان و ژنە. زۆری ژمارەی دانیشتوان، واتای سەرمایەیەکی زیاترە. "ژنێتی ماڵەوە" کارگەی زیادکردنی دانیشتوانە. دەتوانین بەکارگەی بەرهەمهێنانی ئەو موڵکە "منداڵ" بەنرخانە ناوی ببەین کە سیستەم پێویستییەکی زۆری پێیەتی. بەداخەوە لەژێر سایەی سیستەمی باڵادەستی پاوانخوازدا خێزان خراوەتە ناو ئەم ڕەوشەوە. لەکاتێکدا تەواوی ئێش و ئازارو زەحمەتیەکان بەسەر ژندا دەسەپێنرێت، هەرچی بەهای موڵکەکەیە بەهادارترین دیاری سیستەمە. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان هەرە زێدە ژن پەرێشان دەکات. لە ئایدیۆلۆژیای خانەدانێتیشدا ڕەوش بەمجۆرەیە. بەرچاوترین و شیرینترین ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتە خێزانگەراییە، کە دواقۆناخە خانەدانێتی پێی گەیشتبێت. تەواوی ئەم بابەتانە بەزیادیشەوە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای دەوڵەتگەرایی ـ نەتەوە دەبێت بەیەک. چی لەپێگەیاندنی بەردەوامی منداڵ بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە بەهادارترە؟ چونکە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی دەوڵەت ـ نەتەوە، واتای هێزی زیاترە. ئەمەش بەو واتایە دێت کە بەرژەوەندی ژیانی پاوانەکانی پیاو و سەرمایەی بەرتەسک لەژێر تەقینەوەی ژمارەی دانیشتواندا شاراوەیە. زەحمەتی، خەم و پەژارە، سووکایەتی پێکردن، ئێشوئازار، تاوانباری، هەژاری و برسێتی گشتی بەشی ژنە: هەرچی قازانجە دڵخۆشکەرەکەیە هی "بەگ"ەکەی و سەرمایەدارەکەیە. هیچ سەردەمێک لەمێژوودا وەک ڕۆژی ئەمڕۆمان هێز و ئەزموونی ئەوەیان پیشاننەداوە کە ژن وەک ئامرازێکی قۆستنەوەی هەمەلایەن بەکاربێنێت. ژن وەک یەکەمین و دواترین کۆڵۆنی لە هەستیارترین ساتی مێژووی خۆیدا دەژیت.

بەرامبەر بەم ئایینە نوێیەی زایەندپەرستی ماددە کیمیاوییە بێهۆشکەرەکان وەک سفری پاش فاریزەن. لەڕێگای کامپینە ڕیکلامییەکانی میدیاکانەوە تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگا دەکرێن بە گومڕایی و لادەری زایەندی. لاو، پیر، تەنانەت منداڵیش

جیاوازی نییە، هەموو کەسێک بەکار دەهێنرێت. ژن کراوە بە بەهێزترین بابەتی سێکس. هەر تۆزقاڵێک (شوێنێک)ی سێکس نەوروژێنێت مەحکومی زهنییەتێک کراوە هەروەکو بڵێی پارە ناکات. لانەی پیرۆزی خێزان بۆ تەکییەی سێکس گۆڕاوە. "پیرە ژنەکان" وەک پاشماوەی خوداوەندە ژن و دایکی پیرۆز ماونەتەوە، کە فڕێدراونەتە قوژبنێکەوە. رەوشێکی خەمناک و پڕ بەئێشە. لە رێگای دووگیانی دروستکراو (پیتاندنی منداڵ لەناو لوولەکان)ەوە پرۆسەی بوونی ژن بە ئامرازی سێکس بە لووتکە گەیەنراوە.

رەوش و پێگەیەکی پێچەوانەش پێویستی سیستەم وەهای لێکردووە کە تەحەمول نەکرێت. داخوازی وەچەخستنەوەی زۆر و بەتایبەتیش کوڕ کە لە ناوەڕۆکدا نەریتێکی کۆمەڵگای پیاوسالارییە، لە رێگای خستنەگەڕی تەکنۆلۆژیای تەندورستییەوە لە ژنانی چینی خوارەوەدا بۆ رۆڵی ئامێری منداڵبوون گۆڕاوە. بەمجۆرە بەخێوکردنی منداڵان کە کارێکی قورسە دەخرێتە ئەستۆی هەژاران، لەلایەک پێویستی کرێکاری لاو دابین دەکرێت، لەلایەکی دیکەشەوە خراپبوونێکی ئەوتۆ لەخێزاندا پێشدەخرێت کە دەرکەوتن لێی زەحمەتە. بە بەردێک چەند چۆلەکەیەک دەکوژێت. ژن و پیاوی چینی سەرەوە لە رێگای منداڵی (لوولەکان) دروستکراو، هەڵگرتنەوەی منداڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵەوە زاراوەی منداڵیشیان شێواندووە و بەمجۆرە هەوڵی قەرەبووکردنەوەی ناتەواوییەکانیان دەدەن، هەوڵدەدەن تا دوایی بە سێکسی بمێننەوە، ئایینی نوێی سێکس دەکەن بە مەراسیم و لەهۆش خۆیان دەچن. ئەنجام، ژمارەیەکی ئێکجار زۆری بێواتای دانیشتوان، بێکارییەک کە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە، لەگەڵ قەیرانی ژینگە، بارێکی وەهای مرۆڤیان هێناوەتە کایەوە کە هەڵناگیرێت. زیاتر لەبەشی "کۆمەڵناسی ئازادی"دا هەڵوەستە لەسەر چۆنییەتی بەرەنگابوونەوەی ئەم کێشەیە دەکەین.

چاوسووری و خۆپەرستی پیاو سەبارەت بەبابەتی ژن وەک دیاردەی هەنووکەیی هەر سات و کاتژمێرێک دەشێت تێبینی بکرێت. هەر کەسێکی خاوەن ویژدان ناتوانێت ئەو واقیعەرەچاو نەکات کەپیاو لەهەرچینێکی کۆمەڵایەتیدابێت بەبێئەوەی رێز لەهیچ یاسایەکی ئەخلاقی و یاسایی بگرێت، بەبێچاوترووکاندن سەبارەت بەو بابەتەتاوان دەکات. زۆربەی زۆری ئەو هەڵوێستەوەحشیگەریانەلەژێر ناوی "ئەشق"وەئەنجامدەدرێن. لەڕاستیدا ئەگەر کەم زۆر پەیوەندی ئەشق بە حەقیقەتەوە راڤە بکرێت، یەکسەر ئاشکرا دەبێت کەئەو گوتەیەچرووکترین درۆیە. هیچ سۆبژەیەکی لەجیهانی رووەک و ئاژەڵان، تەنانەت لەدونیای فیزیای بە(بێگیان) شرۆڤەی دەکەین بووبێتەبابەتی ئەشق هەرگیز پەنا ناباتەبەر کردەوەیەکی بەمجۆرە. هەرچەندەهەندێک لادان لەدونیا ئاماژەپێکراوەکان جێگای باس بێت کەتائێستا ماناکەیان شیکار نەکراوە، ئاشکرایەکەهۆکارو مانای ئەو تاوانانەی لەم لایەنەوە لە جۆری مرۆڤدا دەبینرێت زۆر جیاوازترە. پەیوەندی ئەو تاوانانەبەزۆرداری و چەوسانەوە لەسەرووی ئەو فاکتەرانەوەدێت کە پێویستەئاماژەیان پێوەبکرێت.

سەرەکیترین پرسیاری لەم بارەیەوەبوروژێنرێت؛ بۆچی سەبارەت بەمەسەلەی ژن پیاو دڕندەئێرەیی و زۆردارە، بەپێی ئارەزووەکانی رۆژانەبیست و چوارکاتژمێر لەدۆخی دەستدرێژی کردندا دەژیت و دەستبەرداری ئەو پێگەیەی خۆی نابێت. بێگومان دەستدرێژیو زۆرداری دەستەواژەیەکی گرێدراوی قۆستنەوەی کۆمەڵگایە، ماهیەتی کۆمەڵایەتی رووداوەکان دەخاتەڕوو، زیاتریش پلەداری، باوکسالاری و دەسەڵات دێنێتەوەبیری مرۆڤ. مانایەکی دیکەی لەقووڵاییەکاندا شاراوەیە؛ خیانەتکردنەلەژیان. پەیوەستبوونی هەمەلایەنەی ژن بەژیانەوەدەشێت هەڵوێستی رەگەزگەرایی کۆمەڵایەتی پیاو ئاشکرا بکات. لەژێر کاریگەری لەکارخستن و لە ناوبەرانەی رەگەزگەرایی، رەگەزپەرستی کۆمەڵگا گوزراشت لەرق، هەڵوێستی دەستدرێژی و زۆردارانەدەکات کەلەدەستدانی دەوڵەمەندێتی ژیان لەژێر کاریگەری رۆڵی پەکخستن و لەناوبەرانەی رەگەزگەرایی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. پەیوەندی غەریزەی زایەند لەگەڵ بەردەوامی ژیان ئاشکرایە. بەڵام هیچ بوونەوەرێک تێبینی نەکراوە کە رۆژانەبیست و چوار کاتژمێر لەناو زهنیەتی پرسێتی زایەندیدا بێت. ئاشکرایەکەژیان تەنیا بریتی نییەلەزایەند. بەپێچەوانەوەجووتبوونی زایەندی بریتیە لە ساتێکی جۆرێک لەمردن، بەمانایەکی دیکەهەڵمەتێکی تەواوکەری ژیانەبەرامبەر بە مردن. لەم سۆنگەیەوە چەندە کردەی زایەندی زیادبێت، بەو رادەیە مانای لەدەستدانی ژیانە.

تەواوی کردەی زایەندی بەکوشندە دانانێم. بەڵکو خەیاڵی ئەبەدیەتیش لە خۆوەدەگرێت. بەڵام ئەو خەیاڵەخودی ژیان نییە، بەپێچەوانەوە تەگبیرێکە بەرامبەر ترسی مردن، ەێندەهەڵگری بەهای حەقیقەتیش نییە. دەشێت گوتەکەبەم جۆرەڕوون بکرێتەوە؛ دووبارەبوونەوەی بازنەی ژیان گرنگەیان خودی بازنەکەوەک تاقانەیەک؟ دوای گوزارشتکردنی تەواوەتی حەقیقەتی تاقانەکە، تا ناکۆتا دووبارەبوونەوەی بازنەکەمانایەکی ئەو تۆ نابەخشێت. ئەو مانایەی لەخۆشیەوەدەگرێت پێویستی گەیشتنەبە"مەعریفەی رەها". لەدۆخێکی بەمجۆرەدا بازنەکەچەندەبەباشی خۆی بناسێت بەو رادەیەپێویستی مەعریفەی رەهای دەستەبەر دەکرێت، ئەو کاتەبازنەکان و لەم سۆنگەوەزێدەبوونی زایەندیش بەهاو مانایەکی ئەوتۆی نامێنێت.

لە کاتێکدا ژیانێکی هاوبەش کە لەمیانەی فەلسەفەیەکی بارکراو بە دیموکراسیخوازی، یەکسانخوازی و ئازادیخوازییەکی ریشەیی لەگەڵ ژن رێکبخرێت، لە بەرکەماڵترین ئاستدا توانای بەرقەرارکردنی جوانی، چاکی و راستی هەیە. من خۆم لەژێر سایەی ئەم ستاتۆیەی لە ئارادایە ژیان لەگەڵ ژن، شانبەشانی ئەوەی زۆر بەکێشە دەبێت، لە هەمانکاتدا زۆر قێزەون، خراپ و هەڵەی دەبینم. لەژێر ئەم ستاتۆیەدا ژیان لەگەڵ ژن بابەتێکە لەمنداڵییەوە جەسارەتم بۆی نەکردووە. ئەوەی لە ئارادایە و جێگای باسە ژیانێکە تەنانەت رەمەکێکی بەهێزی وەک زایەندیش دەخاتە ژێر لێپرسینەوە. رەمەکی زایەند لەپێناو بەردەوامکردنی ژیانە. یەکێک لەسەمەرەکانی سروشتە و شایستەی پیرۆز بینینە. بەڵام پاوانی پیاو و سەرمایە تا رادەیەک ژنیان پیسکردووە، تەنانەت ئەم توانا سەمەرەیەی سروشتیشیان بۆ دەزگایەک"کارگەی منداڵ" گۆڕیوە کەوتووترین کاڵا بەرهەمدێنێت. لەکاتێکدا لە رێگای ئەم کاڵایانەوە کۆمەڵگا سەراوبن دەکرێت، ژینگەش لەژێر قورسایی ژمارەی دانیشتوان (ئێستا شەش ملیارە: بەم خێراییە بەردەوام بێت، دە یان پەنجا ملیار بێت ژینگە چی دەکات) سات بە سات لەناو داڕووخاندا دەژیت. بێگومان ژیان لەگەڵ ژن و منداڵ لەناوەڕۆکدا بوویەرێکی پیرۆزە، نیشانەی کۆتایی نەهاتنی ژیانە. وا دەکات هەست بەنەمری بکەیت. ئایا سۆز و هەستێکی لەمە بەهادارتر هەیە؟ لەژێر ئەم راستینەیەدا بە هەموو جۆرێک لەناوجۆشی هەنگاونان بۆ نەمری دەژیت. بەتایبەتیش ئەم رەوشە لەمرۆڤی رۆژی ئەمرۆماندا هەروەک شاعیرێک دەڵێت "وەچەکانمان بەڵای سەرمانن" بەئاستێکی بەمجۆرە گەیشتووە. لێرەوە ناتوانرێت نکوڵی لەو راستییە بکرێت: جارێکی دیکە رووبەڕووی هەڵە، قێزەونی و بێ ئەخلاقییە گەورەکەی پاوانخوازێتی پیاو و سەرمایەین کە پێچەوانەی سروشتی یەکەم و دووەمە.

ئەوەی بەدەستی مرۆڤ ئاواکراوە، دەتوانرێت بەدەستی مرۆڤیش برووخێنرێت. لێرەدا نە یاسایەکی سروشت، نەچارەنووسێک، هیچیان جێگای باس نین. ئەوەی باس دەکرێت رووخاندنی دابەشکردن و هەڵاواردنی پاوانەکانە کە دەستێکی هۆرمۆنی و شێرپەنجەیی ژیانی سیستەمەکانی تۆڕ، پیاوی بەهێز و فێڵباز و پاوانەکانە. بەردەوام لەناخەوە هەستم بەقووڵایی واتاداربوونی سەمەرەترین جووتی (هێندەی کە زانراوە) ژیانی گەردوون کردبوو. بوێری ئەوەم پیشاندا سەرەتا لەگەڵ ژن بیر بکەمەوە، دواتر لەبارەی کات و شوێن و رادەی خراپەکاریەکانی سەری و چۆنیەتی بە لاوەنانی، گفتوگۆم لەگەڵ کرد؛ ئەوەشم خستە پێشەوەی تەواوی پەیوەندییەکانم لەگەڵ ژندا. بێگومان تەنیا ئەو ژنەی بەهێزە، ژیرە، باشە، جوانە و دەتوانێت بڕیاری راست بدات، بەمجۆرە کاتێک منیش تێپەڕدەکات و شەیدام دەکات و دەتوانێت ببێتە موخاتەبم، هەڵبەتە لەسەرووی بژارەکانی لێگەڕینی فەلسەفیمەوە دێت. بەردەوام لەو بڕوایەدا بووم کە ذهێنییەکانی لێشاوی ژیانی گەردوون لەگەڵ ئەم ژنەوە لەمیانەی باشترین، جوانترین و راستترین لایەنەوە واتاداربێت. بەڵام بەڕادەیەک کە هیچ پیاوێک تێیدا سەرکەوتوو نەبووە، بڕوام بەئەخلاقی خۆم هەبوو کە هەرگیز هورمزی نەوەد هەزار مێردە و موڵکی "پیاو و سەرمایە" ناکاتە هاوبەشی شێوازی هەبوون و ژیانم. لە دۆخێکی وەهادا لەفێمینیزم بەولاوە دەشێت زاراوەی " ژنۆلۆژی" (زانستی ژنناسی) باشتر وەڵامی ئامانجەکە بداتەوە.

زۆر جار دۆخی خۆم لە گەڵ ئەو رەوشەی ناسنامەی ژنەوە بەراورد دەکرد کە بە درێژایی مێژووی شارستانی بەسەریدا سەپێنراوە. لێکچوونم لەنێوان ژیانە کورتە ئانتی ـ مۆدێرنیستەکەی خۆمو بەرخودانی هەزاران ساڵەی ئانتی ـ شارستانی ژن دەدۆزیەوە کە لە گەڵیدا بەراوردم دەکرد. بەمجۆرەش تا دەچوو نەفرەتم لە هەڵوێستی رەگەزپەرستانەی بەرامبەر بە ژن دەکرد، زۆر چەپەڵ و قێزەونم دەبینی. هەر زوو پەیم بەوە بردبوو کە هونەری ژنێتی زۆر ریسواکەرە. ئەو ئەنجامەی لەو هەڵسەنگاندنەکورتەهەڵبەێنجرێت؛ لەسەردەمی سەرهەڵدانی پیاو سالارییەوەژن دووچاری سەرکوتکردن و چەوسانەوەیەکی

سیستەماتیک و دامەزراوەیی داتووە. کۆیلایەتی ژن بەجۆرێک ئاڵۆز و بونیادییەکەناتوانرێلەگەڵ هیچ شێوەیەکی دیکەی کۆیلایەتیدا بەراورد بکرێت، دامەزراوەکانی بازاڕی ژن، کۆیلەکان، کەنیزەکی و حەرەمسەراکانی مێژووی شارستانی تاڕادەیەک دیاردەکەروون دەکەنەوە. بەڵام رەفتار و کردەوەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ زیاتر بەکۆیلەکردنی ژنان بەبێحیساب زیادی کردووە. هیچ شارستانیەک بەقەدەر سەرمایەداری یاری بەژن نەکردووە. بەو رادەیەش قۆستنەوەی ژنانی بەدامەزراوەیی نەکردووە. دیاردەکەقۆستنەوەیەکی وەهای بەخۆوەدیوە، زۆربەی زۆرینەی ژنان کردەگەلێکی ژنیان خستۆتەدۆخێکی سووک و بچووکەوە، وەک تایبەتمەندێتییەسەرەکییەکانی ناسنامەی ژن پیشانیدەدەن؛ تەنانەت بەجۆرێک داگیرکراون کەدەبن بەبەشێکی ئەو یارییانەی لەسەریان بەرێوەدەبرێت و بەبێنیگەرانی جێگای خۆیان لەو یاریانەدا دەگرن. تەنیا باسی چەوسانەوەو سەرکوتکردنی دیاردەیی ناکەین. ژن لەپێشکەشکردنی خۆبەختانەی شێوەکانی زهنیەت، جەستە، رەنگ و دەنگی کۆیلایەتییەک کەلەلایەن سەرجەم خانەو پێکهاتەکانی ژیانی ژن پەسەندکراوەدووڵی ناکات. تەنانەت بێئاگایەلەوەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ حەقیقەتی کۆمەڵگا لەدەستداوەو کراوەبەژیانێک کەلەسەر شانۆ پێشکەش دەکرێت. بەمانەیەکی دیکەدەرفەتی هەستکردن و پەیبردن بەو راستییەی نییە. لەپێناو دەستەبەرکردنی کەرامەت و حەقیقەت و ژیان نەهێشتنی تەمومژەکەی دەوروبەری ژن زۆر گرنگ و بایەخدارە.

لەگەڵ ئەوەی ژیان بەبێ ژن نابێت، بەڵام ژیانێکی سەرفراز و ماناداریش لەگەڵ ژنێک جێگای باس نابێت کەتا ئەو رادەیەبچووک و سووککراوە. لەمیانەی تێگەیشتنو هەستکردن بەو راستییەی کەژیان لەگەڵ ئەو ژنەئاماژەپێکراوەدا شێوازێکەکەهەمووان تا بینەقاقا نقوومی سووکترین کۆیلایەتی دەکات؛ لەم چوارچێوەیەشدا شیکارکردن و نانەوەی هەنگاوی کرداری لەپێناویدا رێگای راستی رزگارکردنی ژیانە. پێویستەهیچ کاتێک لەبیرنەکرێت کەژیانێکی مانادار و شەرەفمەندانەلەگەڵ ژندا پێویستی بەشکۆداری و داناییەکی مەزن هەیە. ئەوانەی بانگەشەی ئەشقیش دەکەن پێویستەبەردەوام لەیادیان بێت کەرێگاکەی بەشکۆمەندی و داناییدا تێپەڕدەبێت. چونکەپێچەوانەکەی خیانەتکردنەلەئەشقو خزمەتکردن بەکۆیلایەتییە. تا بەحەقیقەتی کۆمەڵگا نەگەیت گەیشتن بەئەشق جێگای باس نابێت.

### ٦. ژنۆلۆژی وەک زانستی ژنناسی.

ئازادی ژن لە شێوەگرتنی شارستانیەتی نوێدا، رۆڵی هاوسەنگی و یەکسانیخوازی دەبینێ. ئەو ژنەی لەدوای هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگای نیۆلیتیک بەدواوە هەروەکو بڵێی لەناو کۆمەڵگا سڕاوەتەوە، دووبارە لەنێو هەلومەرج و زەمینەیەکی ئازادی و یەکسانی جێگای خۆی دەگرێت و رێزی لێدەگیرێت. لەم پێناوەشدا هەموو تێکۆشانێکی تیۆری، بەرنامە، رێکخستنی و کرداری ئەنجام دەدرێت. راستینەی ژن زۆر لە زاراوەی چینی پرۆلیتار و نەتەوەی ژێردەست بەرجەستەترە، کە سەردەمێک لافی بۆ لێدەدرا. دەتوانرێ بگوترێ بنەڕەتیترین وەرچەرخانی کۆمەڵگا، لە میانەی ئەو وەرچەرخانەوە یەکلادەبێتەوە کە ژن ئەنجامیدەدات. ژن چەندە لەنێو ئازادی و یەکسانیدابێت، ئەوا تەواوی توێژەکانی کۆمەڵگاش بەو ئەندازەیە ئازادن و لەناو یەکسانیدا دەژین. دیموکراتیزەبوونی ژنان رۆڵێکی دیاریکراوی دەبێت لە جێگیرکردنی علمانیەت و دیموکراسیەت بە شێوەیەکی هەمیشەیی. تەنانەت ئەم پێناسە بەرنامەڕێژییە کورتەی سەبارەت بە دیاردەی ژن ئەنجامدرا، ئەوە نیشاندەدات ژنان پێشەنگایەتی جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی نوێ دەکەن و رەنگی ژن بەخۆیەوە دەگرێت.

چاخی شارستانیەتی دیموکراسیانە بە ئەندازەی ئەوەی سەرلەنوێ لە دایکبوونی گەلانە، بە شێوەیەکی زەقتر سەردەمی لە دایک بوونی ژنانە. ژن کە هێزی خوداوەندی زایینی کۆمەڵگای نیۆلیتیک بوو بە درێژایی مێژووی کۆمەڵگای چینایەتی، بەردەوام رووبەڕووی وون بوون ماوەتەوە. بە واتایەکی دیکە مێژوو، مێژووی ئەو پیاوە باڵادەستەیە لەگەڵ بەرزبوونەوەی کۆمەڵگای چینایەتی بووە خاوەن هێز. کارەکتەری باڵادەستی چینایەتی لەگەڵ کارەکتەری پیاوی باڵادەست بەیەکەوە پێکدێن. لێرەشدا ئەو

یاسایانەی پەیڕەویان لێدەکرێت، درۆ میتۆلۆژیەکان و سزادانە ئیلاهیەکانە. بەڵام زەبری قەبە و رووت و راستینەی چەوسانەوە لەژێر ئەمەدا شاراوەیە. کارەکتەری پیاوی باڵادەستی کۆمەڵگا، تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان تەنانەت دەرفەتی ئەوەی نەداوە هەڵسەنگاندنێکی زانستیانە سەبارەت بە دیاردەی ژن بکرێت. لە ئایین زیاتر بە بابەتێکی تابۆ کراو لە قەڵەم دەدرێت. لە راستیدا لەژێر ناوی نامووس راستینەی ژن و مافەکانی شاراوەتەوە کە پیاو بە شێوەیەکی تەڵەکەبازی و خائینانە و زۆردارانە زەوتی کردووە. بە درێژایی مێژوو بێبەشکردنی ژن لە ناسنامە و کەسایەتی خۆی و گرێدانی بە پیاوەوە، دیاردەیەکە لە جیابوونەوەی چینایەتی زیاتر رێگای لەپێش دەرئەنجامی خراپتر کردۆتەوە. دیلێتی ژن، پێوانەیەکی کۆیلایەتی گشتی و کەوتنە؛ پێوانەیەکی ئەو درۆ و دزی و زۆردارییەیە کە لەناو کۆمەڵگا بڵاوبۆتەوە؛ پێوانەی هەموو جۆرە فرێژی و خولامێتییەکە.

بە پێچەوانەوە گۆڕینی ئەم مێژووە، بەڵگە نەویستە کە ئەنجامی کۆمەڵایەتی قووڵ لەگەڵ خۆیدا دێنێ. سەرلەنوێ لە دایکبوونی ئازادانەی ژن، تەواوی دەزگاکانی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگا ئازادی و رۆشنگەری و دادوەری گشتی دەکاتە ناچاریەک. مرۆڤایەتی بەوە ئیقناع دەکات لە جیاتی شەڕ ئاشتی زۆر بەهادارترە و پێویستە بەرز بکرێتەوە. سەرکەوتنی ژن، لە هەموو ئاستێکدا بە واتای کۆمەڵگا و تاکی سەرکەوتوو دێت. تەنانەت ئەم چوارچێوە کورتەش ئەوە روون دەکاتەوە، ئەنجامدانی دیموکراتیزەبوون لە گۆڕەپانی ئازادی و مافەکانی ژن، چەندە مێژووییە. لەم چوارچێوەیەدا دەستپێکردنی سەردەمی ئەو ژنەی وشیار بۆتەوە، ئازاد و بەهێز بووە، لە سەدەی ٢١ مدا دیاردەیەکە لە رزگاری چینایەتی و نەتەوەیی گرنگترە. سەردەمی شارستانیەتی دیموکراسیانە، لەهەر قۆناخێک زیاتر ژن تێیدا بەرز دەکرێتەوە و دەسکەوت بەدەست دێنێ.

دەبێ ئازادی ژن بەگوێرەی پێناسەی دیاردەکە گشتگیربێ. لەوانەیە ئازادی و یەکسانی گشتی کۆمەڵگا راستەوخۆ بۆ ژنانیش بەواتای ئازادی و یەکسانی نەیە. هەوڵی سەربەخۆو رێکخستن مەرجە. دیسان دەشێ بزووتنەوەی گشتی دیموکراتیزەبوون دەرفەت و تواناکاری بۆ ژنان بخوڵقێنێ. بەڵام لەخۆیەوە دیموکراسی ناهێنێ. بەتایبەتی پێویستە ژنان ئامانج و رێکخستن و هەوڵی دیموکراتییانەی خۆیان نیشانبدەن. بەرلەهەمووشتێک پێویستی بەپێناسەیەکی ئازادی هەیە رووبەرووی ئەو کۆیلایەتییە ببێتەوە کە ژن تێیدا دەژی. هێزی سیستەمی سەرمایەداری لەبواری نیشاندان و دانانی سەراب لەجێگای راستی هێندە پێشکەوتووە، تەنانەت کردەوەیەکی کە هەرەزێدە سووکایەتی بەژن دەکات و بچووکی دەکاتەوە (بۆ نموونە پۆرنۆگرافی ـ سێکسی کراوە) هاوشێوەی ئازادی دەبینرێ.

سەرباری ئەوەی هەوڵەکانی فێمینیزم چەندین فاکتەری گرنگ لەخۆوە بگرێت، بەڵام هێشتا لە تێپەڕکردنی ئاسۆی دیموکراسییەتی سەنتەری ئەوروپا دوورە. نەک تەنیا شێوە ژیانی سەرمایەداری تێپەڕنەکردووە، بەڵکو ناتوانرێ بگووترێ کەدەرکیشی پێکردووە. رەوش بانگەوازی بۆ چەمکی شۆڕشی سۆسیالیزمی لینینی دەکات. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و کۆششە مەزنەو بەدەستهێنانی چەندین پێگەی گرنگ، لەئاکامدا لینینیزم لەوە رزگاری نەبوو کە لەلایەنی چەپەوە بەهادارترین کۆمەک بەسەرمایەداری نەکات. لەوانەیە فێمینیزمیش دووچاری هەمان ئەنجام ببێت. نەبوونی بناخەیەکی بەهێزی رێکخستنی، پێشنەخستنی فەلسەفەکەی بەشێوەیەکی تەواو، ئاستەمییەکانی سەبارەت بەمیلیتانێتی ژنان بانگەشەکەی لاواز دەکات. لەوانەیە بەئاستی بەرەی ژنانی تایبەت بەسۆسیالیزمی بونیادنراویش نەگات. بەڵام سەبارەت بەسەرنجراکێشان بۆ سەر بابەتەکە، هەڵسەنگاندنی وەک هەنگاوێکی رشت و بەرچاو لەجێی خۆیەتی.

دەستەواژەی فێمێنیزم کە لە زمانی تورکی بە واتای بزووتنەوەی کادنجیلیک (ژنگەرایی) دێت، لە پێناسەکردنێکی تەواوەتی کێشەی ژن دوورە، لەبەر ئەوەی بەرامبەرەکەشی وەک پیاوگەرایی وێنا دەکرێت دەشێت زیاتر بەرەو نەزۆکی ببات. واتایەکی بەمجۆرە پیشاندەدات وەک بڵێی ژنە چەوسێنراوەکەی پیاوی باڵادەستە. کەچی راستینەی ژن زۆر بەرفراوانترە. لەولاتری رەگەزەوە واتا و رەهەندی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر زاراوەی کۆلۆنی لە چوارچێوەی وڵات و نەتەوەکان دەربخەین و لەسەر گروپە مرۆڤییەکانی پێڕەو بکەین، لە راستیدا هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵگا لەبواری جەستەیی و رۆحییەوە

**بەقەدەر ژن داگیرکاری نەبینیوە. پێویستە دەرک بەم خاڵە بکرێت، ژن لە پێگە و ستاتۆی کۆڵۆنیەکدایە کە بە ئاسانی سنوورەکانی دیار ناکرێت.**

**هەروەک لە تەواوی زانستەکانی دیکەشدا جێگای باسە، زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش کە پیاوێتی مۆرکی خۆی لێداوە، ئەو دێڕانەی لە چوارچێوەی ئەم گووتانەی باس لە ژن دەکات، بەو هەڵوێستە حەماسی و پروپاگەندەییانەوە باسکراوە کە هەرگیز نزیکی راستی نەبۆتەوە و دەستی بۆ نەبردووە. هەروەک چۆن ئەمجۆرە گووتانە چین، چەوسانەوە، فشار و ئەشکەنجەکانی مێژووی شارستانیان پەردەپۆش کردووە، چل ئەوەندەش ستاتۆ راستەقینەکەی ژنیشی شاردۆتەوە. لەجیاتی فێمێنیزم دەشێت زاراوەی ژنۆلۆژی (زانستی ژن ناسی) باشتر وەڵامی ئامانجەکە بداتەوە. هەر چۆنێک بێت ئەو دیاردانەی ژنۆلۆژی ئاشکرایان بکات لایەنی راستییان لە زۆربەی بەشەکانی دیکەی سۆسیۆلۆژی لە جۆری تیۆلۆژی(خوداناسی)، ئەسکاتۆلۆژی(ئاخیرەتناسی)، پۆلیتیکۆلۆژی (سیاساتناسی) و پیداگۆژی (زانستی پەروەردە)دا کەمتر نییە. راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە ژن هەم لە بواری جەستە هەمیش لەبواری واتاوە بەرفراوانترین بەشی سروشتی کۆمەڵایەتی پێک دێنێت. کەواتە بۆچی ئەم بەشە زۆر گرنگەی سروشتی کۆمەڵایەتی نەکەین بە بابەتی زانست؟ ئەو سۆسیۆلۆژییەی لە پێداگۆژییەوە تا دەگاتە زانستی نەشونوماکردنی منداڵان و پەروەردەکردنیان بۆ چەندین پارچە دابەش بووە، ژنۆلۆژی ئاوانەکردووە، هۆکارەکەشی جگە لە گوتەی باڵادەستێتی پیاو هیچ شتێکی دیکە روونی ناکاتەوە.**

**تا سروشتی ژن لە تاریکیدا بمێنێتەوە، ئەوا تەواوی سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاش لە ناڕوونیدا دەمێنێتەوە. رۆشنکردنەوەی بەرفراوان و راستەقینەی سروشتی کۆمەڵایەتی تەنیا لەمیانەی رۆشنکردنەوەیەکی راستەقینە و بەرفراوانی سروشتی ژنەوە بەدیدێت. کاتێک لەمێژووی کۆڵۆنیکردنیەوە تا دەگاتە کۆڵۆنیکردنی لە بواری ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و زهنییەوە پێگەی ژن رۆشن بکرێتەوە، ئەوا کۆمەکێکی مەزن بە ئاشکرابوونی سەرجەم بابەتەکانی دیکەی مێژوو و هەموو بوارەکانی کۆمەڵگای رۆژی ئەمڕۆمان دەکات.**

**بێگومان ئاشکراکردنی ستاتۆ (پێگە)ی ژن رەهەند و لایەنێکی مەسەلەکەیە. رەهەندی گرنگتر پەیوەندی بە کێشەی رزگارییەوە هەیە. بە گوتەیەکی دیکە چارەسەرکردنی کێشەکە گرنگییەکی زیاتر و مەزنتری هەیە. زۆر جار دەگووترێت کە ئاستی ئازادی گشتی کۆمەڵگا بە رادەی ئاستی ئازادی ژنەوە پەیوەستە. ئەوەی گرنگە چۆنیەتی پڕکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەم گوتەیەیە. چونکە یەکسانی و ئازادی ژن تەنیا یەکسانی و ئازادی کۆمەڵگا دەستنیشان ناکات. بەڵکو لەم پێناوەدا تیۆری، بەرنامە، رێکخستن و چالاکی گونجاویش پێویستە. لەمەش گرنگتر پیشانیدەدات کە بەبێ ژن سیاسەتی دیموکراتییانە نابێت، تەنانەت سیاسەتمەدارێتی چینایەتیش ناتەواو دەمێنێتەوە، ئەوکاتە ئاشتی و ژینگەش پێش ناخرێن و ناپارێزرێن.**

**پێویستە ژن لە ستاتۆی دایکی پیرۆز، ناموسی سەرەکی، هاوسەری دەست لێبەرنەدراو دەربخەین و وەک کۆی سۆبژە . ئۆبژە هەڵیسەنگێنین و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەین. بێگومان بەر لە هەموو شتێک پێویستە ئەم لێکۆڵینەوە لە گاڵتەجاڕیەکانی ئەشق بپارێزین. تەنانەت یەکێک لە گرنگترین رەهەندەکانی لێکۆڵینەوەکە پێویستە ئەو چەپەڵییە گەورانە ئاشکرا بکات و پیشانی بدات کە بەناوی ئەشقەوە دەکرێت (لاقەکردن، کوشتن، لێدان، ئەو جنێوانەی هەزاری دینارێک ناکات). گوتەی "سەرجەم شەڕەکانی رۆژهەڵات . رۆژئاوا بەهۆی ژنەوە روویداوە" کە هیرۆدوت گووتویەتی، تەنیا دەتوانێت راستییەک روون بکاتەوە، ئەویش ئەوەیە؛ وەک کۆڵۆنیەک بەهاداربووە، هەر بۆیە کراوەتە بابەتی شەڕە گرنگەکان. هەروەکو چۆن مێژووی شارستانی بەمجۆرەیە، مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش نوێنەرایەتی داگیرکارییەک دەکات کە هەزاران قات قورسترە و بەشێوەیەکی هەمەلایەنەترە. ئەمەش لەسەر ئاسنامەی ژن نەخش دەکرێت. کۆڵۆنیکردنی بەشێوەی دایکی سەرجەم رەنجەکان، خاوەن رەنجی بێ بەرامبەر، کرێکاری کەمترین کرێ، بێکار، سەرچاوەی فشار و ئارەزووی سنوور نەناسی پیاو، کارگەی سیستەم بۆ وەچەخستنەوە، دایانی بەخێوکردنی منداڵ، ئامرازی ریکلام، ئامرازی سێکس و پۆرنۆ و..هتد بەردەوام دەبێت. سەرمایەداری بەجۆرێک میکانیزمی چەوساندنەوەی سەبارەت بە ژن پێشخستووە کە لە هیچ سیستەمێکی دیکەی چەوسانەوەدا بەم رادەیە نەبووە. هەرچەندە**

خوازیاریش نەبین بەڵام چەندین جار گەڕانەوەمان بۆ سەر تاووتوێکردنی ستاتۆی ژن بە ئازارە. بەڵام زمانی راستییەکان بۆ چەوساوەکان بەجۆرێکی دیکە نابێت.

لەژێر رۆشنایی ئەم راستییانەدا بێگومان بزووتنەوەی فێمێنیستی ناچارە ببێتە رادیکاڵترین بزاوتی رکابەری دژە سیستەم. بزووتنەوەی ژنان بەم دۆخە مۆدێرنەی دەتوانین ریشەکەی بۆ شۆڕشی فەرەنسا بگەڕێنینەوە، دوای چەند قۆناخێک توانیویەتی بە رۆژگاری ئەمڕۆمان بگات. لە یەکەمین قۆناخدا دوای یەکسانی یاسایی کەوتن. ئەم یەکسانییە کە واتایەکی ئەوتۆی نییە وەک بڵێی لە رۆژگاری ئەمڕۆمان بەشێوەیەکی بەربڵاو بەدیهاتووە. بەڵام پێویستە باش بزانرێت ناوەڕۆکەکەی پووچە. هەروەکو مافە ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان پێشکەوتنی رووکەشیانەی مافەکانی مرۆڤیش جێگای باسە. لەپێناو دیموکراسی، یەکسانی و ئازادی ژن کە تەنیا مۆدێرنیتەی فەرمی بەندی نەکردووە، بەڵکو سەرجەم قۆناخەکانی شارستانی و پلەداری لە بواری زهنی و جەستەیی تەواوی شانەکانی بەندکردووە و لەمیانەی قووڵترین کۆیلایەتییەوە بەکاری دێنێت، خەباتێکی تیۆری بەرفراوان، تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی، چالاکی رێکخستنی و بەرنامەیی و گرنگترینیشیان چالاکی بەهێز پێویستە، ئەگەر ئەمانە نەبن فێمێنیزم و خەباتی ژنان لە چالاکی ژنە لیبراڵەکان بەولاوە واتایەکی دیکەی نابێت کە هەوڵی دڵنیاکردنی سیستەم دەدات.

لەدۆخێکدا زانستی ژنناسی پێشبکەوێت، روونکردنەوەی چارەسەرکردنی کێشەکان لە رێگای نموونەیەکەوە چەندەی بڵێین سوودبەخش دەبێت، پێویستە تێبگەین کە غەریزەی زایەند لەسەرووی شێوە هەرە کۆنەکانی فێربوونی ژیان دێت. وەڵامی پێداویستی بەردەوامکردنی خودی ژیانە. نەبوونی دەرفەتی ژیانی ناکۆتای تاک، چارەسەرییەکەی تاکی ناچار کردووە پۆتانسێلی سەرلەنوێ خۆ ئافراندنەوە پێشبخات. ئەو شتەی بە ئارەزوو و رەمەکی زایەند ناو دەبرێت، لە هەلومەرجی گونجاودا ئەم پۆتانسێلە بەرهەم دێنێت و بەردەوامی بە ژیان دەدات. بەجۆرێک لە جۆرەکان دەبێتە رێگەچارەی هەرەشەی لەناوچوونی رەچەڵەک و مردن. یەکەم دابەشبوونی خانە، خۆ بەنەمرکردنی تاکخانەیە لەرێگای زۆربوونەوە. ئەگەر گشتگیرتری بکەین، بوویەری بەردەوامکردنی مەیلی ناکۆتاییبوونە لە ژیانی بوونەوەردا کە بەرامبەر بەو نەبوون و بۆشاییەی هەوڵی قووتدانی گەردوون دەدات، بەردەوام لەمیانەی هەمەڕەنگ کردنی خۆیەوە هەوڵی بۆ دەدات.

ئەو تاکەی ئەم بوویەرە گەردوونییە لەجۆری مرۆڤدا درێژە پێدەدات زیاتر ژنە. چونکە زۆربوون لە جەستەی ژندا روودەدات. رۆڵی پیاو لەم رووداوەدا تا دوارادە لاوەکییە. لەم سۆنگەیەوە؛ لە ئەستۆگرتنی تەواوی بەرپرسیارێتی بوویەری بەردەوامکردنی رەچەڵەک لەلایەن ژنەوە لە بواری زانستییەوە مایەی تێگەیشتنە. چونکە ژن تەنیا بە هەڵگرتنی کۆرپەلە لەسکیدا، پێگەیاندن و لەدایکبوونی ناوەستێت، بەڵکو تا مردنیش بەشێوەیەکی سروشتی بەرپرسیارێتی بەخێوکردنی لە ئەستۆ دەگرێت. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا یەکەمین ئەنجامی بەدەستی بێنین، سەبارەت بە تەواوی بابەتەکانی پەیوەندی زایەندی پێویستە ژن خاوەن گوتە و بڕیاری مسۆگەر بێت. چونکە هەر پەیوەندییەکی زایەندی لە بواری پۆتانسێلدا چەندین کێشەی قورس لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە بەرگەگرتنی ئاستەمە. پێویستە تێبگەین ئەو ژنەی دە منداڵ بخاتەوە لەبواری جەستەیی بگرە لەبواری رۆحیشەوە دەکەوێتە رەوشێکەوە زۆر لەمردن خراپترە.

تێڕوانینی پیاو سەبارەت بە زایەند نادروست و نابەرپرسیارانەیە. بە پلەی یەکەم جەهالەت و کوێرایی دەسەڵات رۆڵ لەم رەوشەدا دەبینن. هەروەها لەگەڵ دەرکەوتنی پلەداری و دەوڵەتی خانەدانێتیدا فرە منداڵی بۆ پیاو بە واتای هێزێکی دەست لێبەرنەدراو دێت. منداڵی زۆر، بە تەنیا بە واتای بەردەوامکردنی رەچەڵەک نایەت، بەڵکو مانەوەی دەسەڵات و دەوڵەتیش مسۆگەر دەکات. لەدەست نەدانی دەوڵەت کە بەجۆرێک لە جۆرەکان بە واتای پاوانی موڵک دێت، گرێدراوی گەورەیی خانەدان و بنەماڵەیە. بەمجۆرە لەپێناو هەبوونی بایۆلۆژی و هەبوونی دەوڵەت و دەسەڵاتدا ژن دەکرێت بە ئامرازی وەچەخستنەوەی زۆر. بەمەش گرێدراو بەسروشتی یەکەم و دووەم بناخەی داگیرکارییە ترسناکەکەی ژن دادەنرێت. گرێدراو بەم دوو سروشتەوە شیکارکردنی دارووخانی ژن بایەخدارە. هێندە پێویستی بە روونکردنەوە نییە، تا بزانین لە ژێر ستاتۆی ئەم دوو سروشتەدا مەحاڵە بۆ ماوەیەکی درێژ ژن لەبواری رۆحی و جەستەییەوە بتوانێت بەشێوەیەکی تەندروست و چالاک لەسەر پێیان بمێنێتەوە.

داڕووخانی جەستەیی و رۆحی بەشێوەیەکی تێکەڵ پێشوەخت پەرەدەسەنێت و بەرامبەر بە بەردەوامکردن و مسۆگەرکردنی ژیانی هەندێکی تر، لەمیانەی ژیانێکی کورت خایەنی پڕ لەئێش و خەمباری ژن کۆتایی دێت. شیکارکردن و خوێندنەوەی مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە لەسەر بنەمای ئەم واقیعە گرنگییەکی زۆری هەیە.

کارەساتی کێشەکە سەبارەت بە ژن لەلایەکەوە دابنێین. زێدەڕۆیی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان کە کاریگەرییە قورسەکانی خۆی کردۆتە سەر سەرجەم سروشتی کۆمەڵگا و ژینگەی ئیکۆلۆژی، واتە رەهەندی کێشەی دیموگرافی خۆی دەسەپێنێت. یەکێک لەو وانە و پەندە سەرەکیانەی پێویستە سەبارەت بە زانستی ژنناسی و سەرجەم زانستە کۆمەڵایەتییەکان وەربگیرێت ئەوەیە کە ژمارەی مرۆڤ لە میانەی پەیڕەوی "فێربوونی غەریزی" بەردەوامی پێنەدراوە و گەورە نەکراوە، لە هەندێک رەوشی دەگمەنیشدا بەگوێرەی ئەو بچووک نەکراوەتەوە. رەمەکە خۆڕسکەکان کە سەرەتاییترین پەیڕەوی بەردەوامکردنی رەچەڵەکن پشتگیریکردنی لەمیانەی ئەو پەیڕەوە زانستیانەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە پێشخراوە، هۆکاری سەرەکی زۆربوونە زێدەڕۆییەکەی ژمارەی دانیشتوانە. تەنیا لەمیانەی رێگاکانی رەمەکی خۆڕسک، بەتایبەتیش لەمیانی پاڵنانی رەمەکی زایەندەوە درێژەدان بە هەبوونی جۆری مرۆڤ کە سروشتی کۆمەڵایەتیشە، گوزارشت لە رەوشێکی زۆر دواکەوتوو دەکات. چونکە ژیری و ئاستی کولتووری پۆتانسێلێکی فێربوون پێشکەش بە هەبوونە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن کە بتوانن بە ماهیەتێکی پێگەیشتووتر درێژە بە خۆیان بدەن. واتە تاک و جڤاتەکان لەمیانەی ژیری و کولتوورەکانیان، دامەزراوە فەلسەفی و سیاسییەکان لە رەوشێکدان کە لەماوەیەکی درێژخایەندا دەتوانن دەرفەتەکانی خۆژیاندارێکردن بەکاربێنن. لەم سۆنگەیەوە؛ لە میانەی زۆربوون لەرێگای رەمەکی زایەندییەوە پێویستی بە بەردەوامکردنی رەچەڵەک نامێنێت. چونکە ژیری و کولتووری مرۆڤ لە مێژە ئەم پەیڕەوەی دەرباز کردووە. هەربۆیە لە بنەڕەتدا پرەنسیپی قازانجی شارستانی و مۆدێرنیتە بەرامبەر ئەم دواکەوتوویە بەرپرسیارە. بێگومان زیادبوونی زێدەڕۆییانەی ژمارەی دانیشتوان زێدەڕۆیی دەسەڵات و پاوانە. ئەویش یەکسانە بە زێدەڕۆییترین و زیاترین قازانج. زیادبوونی زێدەڕۆییانەی جۆری مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو، نەک تەنیا کۆمەڵگای خۆی بەڵکو ژینگە و سروشتەکەشی رووبەڕووی لەناوچوون کردۆتەوە، مسۆگەر ئەمەش ئەنجامی سەرمایەداری کۆکراوە و کەڵەکەبوونی دەسەڵاتە، واتە ئەنجامی یاسای زۆرترین قازانجە. تەواوی فاکتەر و هۆکارەکانی دیکەش لە پلەی دووەمدا رۆڵ دەبینن.

لە دۆخێکی بەمجۆرەدا، پێویستە بەرپرسیارێتی سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەی ژن بەدەستی ژنەوە بێت کە بە رەهەندی مەزن گەیشتووە، لەرێگایەوە کێشەی دیموگرافی چارەسەر دەبێت کە رێچکەی لەپێشینەیی بەربەستکردنی ئەو وێرانکارییە ئیکۆلۆژییەیە کە بە ئاستێکی بەرز گەیشتووە. یەکەمین مەرجی ئەمەش ئازادی و یەکسانی تەواوەتی ژنە، مافی تەواوەتی ئەنجامدانی سیاسەتی دیموکراتییانەیە، لە سەرجەم پەیوەندییە زایەندییەکان خاوەن مافی گوتە و ئیرادەی تەواوە. لە دەرەوەی ئەم واقیع و راستینەیە بە تەواوی واتا رزگاری، ئازادی و یەکسانی ژن، کۆمەڵگا و ژینگە مەحاڵە. هەڵبەتە ئەگەری شێوەگرتنی سیاسەتی دیموکراتی و سیاسەتی کۆنفیدراڵیش نابێت.

هەروەها بەو سیفەتەی ژن فاکتەری سەرەکی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە، ئەوا لەژێر رۆشنایی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتیزەبووندا سەبارەت بە جوانی و ئاکاری ژیان رۆڵێکی ژیانی دەبینێت. زانستی جوانی و ئاکار بەشێکی دانەبڕاوەی زانستی ژنناسییە. بەهۆی ئەو بەرپرسیارێتییە قورسەی لە ژیاندا هەیەتی، هیچ گومانێکی تێدا نییە کە وەک هێزی هزر و کردار سەبارەت بە تەواوی بابەتەکانی ئاکار و جوانی ژن کرانەوە و پێشکەوتنی مەزن ئەنجامدەدات. بە بەراورد لەگەڵ پیاو رایەڵە و پەیوەستبوونی ژن بە ژیانەوە زۆر بەرفراوانترە. پێگەیشتوویی رەهەندی ژیری سۆزداریش پەیوەندی بەمەوە هەیە. لەم سۆنگەیەوە؛ بەو سیفەتەی ئەستاتیک جوانکردنی ژیانە، سەبارەت بە ژن بابەتێکی ژیانی و هەبوونە. هەروەها سەبارەت بە ئەتیک ـ ئاکار (تیۆری ئەخلاق، ئەستاتیک = تیۆری جوانی)یش بەرپرسیارێتی ژن فراوانترە. رەفتاری واقیعی و بەرپرسانەی ژن سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی لایەنە باش و خراپەکانی پەروەردەی مرۆڤ، گرنگی ژیان و ئاشتی، خراپی و سامناکی شەڕ، دەستنیشان کردن و بڕیاردان لە بارەی پێوانەکانی ماف و دادوەرییەوە سەبارەت بە کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییەوە وەک

پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. هەڵبەتە باسی ئەو ژنە ناکەم کە مەقاشی دەستی پیاوە و سێبەرەکەیەتی. ئەوەی جێگای باسە، ئەو ژنەیە کە ئازادە، یەکسانە و دیموکراتیزەبوونی پەسەندکردووە.

پێشخستنی زانستی ئابووریش وەک بەشێکی زانستی ژن راستتر دەبێت. لە سەرەتاوە ئابووری شێوەیەکی چالاکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە کە ژن رۆڵی بنەڕەتی تێدا بینیوە. لەبەر ئەوەی کێشەی بەخێوکردنی منداڵان لە ئەستۆی ژندایە، ئابووری واتایەکی ژیانیی بۆ ژن هەیە. لە راستیدا گوتەی ئابووری(NOMY،ECO) بە واتای "یاسای ماڵ، رێساکانی گوزەراندنی ماڵ" دێت. ئاشکرایە کە ئەمەش لەکارە سەرەکیەکانی ژنە. زەوتکردنی ئابووری لە دەستی ژنەوە و رادەستکردنی بە سووخۆر، بازرگان، پارە، سەرمایەدار و دەسەڵات . دەوڵەت و ئەو فەرمانڕەوایانەی وەک ئاغا رەفتار دەکەن، کوشندەترین گورز بوو بەر ژیانی ئابووری کەوت. ئەو ئابوورییەی رادەستی هێزەکانی دژە . ئابووری کراوە، بەتایبەتیش کاتێک بە خێرایی دەکرێتە سەرەکیترین ئامانجی دەسەڵات و ملیتاریزم، بە درێژایی مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە دەکرێت بە فاکتەری سەرەکی تەواوی ململانێ، تەنگەژە، پێکدادان و شەڕە سنوورنەناسەکان. لە رۆژگاری ئەمرۆماندا ئابووری کراوەتە مەیدانی یارییەک لەلایەن ئەوانەی هیچ پەیوەندییەکان بە ئابوورییەوە نییە، یاری بە پارچە کاغەز دەکرێت و لە رێگای پەیرەوی زۆر لە قومار خراپترەوە بەشێوەیەکی بێ سنوور بەهای کۆمەڵایەتی زەوت دەکەن. پیشەی پیرۆزی ژن، بە تەواوی ژنی لێ پەراوێزکراوە، بۆ یارییەکانی نرخ و سوود، بۆرسە و وەرشەکان گۆڕاوە کە بەرهەمەکانی جوانکاری و ئەو بەرهەمە زیادانە بەرهەم دێنێت کە هیچ پەیوەندییەکی بە پێویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤەوە نییە و لە میانەی ئامرازەکانی هاتووچۆ و ئامێرەکانی شەڕەوە ژینگەی بەدۆخێک گەیاندووە کە دەرفەتی ژیانی تێدا نەماوە.

بزووتنەوەی ئازادی، یەکسانی و دیموکراتی ژنان کە فێمێنیزمیش لەخۆوە دەگرێت و پشت بە زانستی ژنناسی دەبەستێت ئاشکرایە کە لە چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا رۆڵی سەرەکی دەبینێت. پێویستە بە رەخنەکردنی بزووتنەوەی ژنانی رابردووی نزیک سنووردار نەمێنێت، بەڵکو دابەزێتە سەر مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتە کە زیاتر ژنی فەوتاندووە. ئەگەر بابەتی ژن، کێشەکەی و بزووتنەوەکانی جێگەیان لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا هێندە کەمە وەک بڵێی نییە، بەرپرسیاری سەرەکی ئەمە زهنییەت و بوونیادی هەژموونگەرایی شارستانی و مۆدێرنیتەیە. دەشێ لەرێگای هەڵوێستی حقوقی و سیاسی تەسکی یەکسانیی کۆمەک پێشکەش بە لیبراڵیزم بکرێت. بەڵام لەمیانەی ئەم هەڵوێستانە نەک هەر تەنیا کێشەکە چارەسەر نابێت، تەنانەت وەک دیاردەش شیکار ناکرێت. بانگەشەیەکی لەو جۆرە کە بزووتنەوە فێمێنیستییەکانی لە ئارادان دابڕاو لە لیبراڵیزم، بوونەتە هێزێکی رکابەری سیستەم، خۆخەڵەتاندنە. وەک بانگەشە دەکرێت ئەگەر یەکێک لەکێشە سەرەکییەکانی فێمێنیزم رادیکاڵیزم بێت، ئەوکاتە پێویستە بەشێوەیەکی ریشەیی پەیوەستبوونی خۆی بەخوو و ئاڵوودەبوونەکانی لیبراڵیزم، شێوازی هزر و هەستیان و ژیانیان بپچڕێنن، هەروەها دوژمنی ژن شیکار بکەن، واتە شارستانی و مۆدێرنیتە شیکار بکەن کە لە پشت لیبراڵیزمەوەن. پێویستە لەسەر ئەم بنەمایە رێگا واتادارەکانی چارەسەری بگرنەبەر.

فێمێنیستەکانیش باوکسالاری رەخنەدەکەن، بەڵام بەهەمان زەلالیو راشکاوانە ئەو وێرانکارییانە رەخنە ناکەن کە مۆدێرنیتە ژنی دووچار کردووە. تەنانەت کاتێک رەخنەشی دەکەن بەڵام لەئافراندنی رەوت، بزووتنەوەو سیستەمێکی ئەلتەرناتیفی ژنو کۆمەڵگا لەناو جۆرێک بێچارەییدا دەژین. بزووتنەوە کولتووریو ئایینییە رادیکاڵەکانیش هێشتا وەک بزاوتو رەوتی بەرهەڵستکاری مۆدێرنیتە لاوازن. ئەوەی لەپێناویدا هەوڵدەدەن سازشکارییەکی باڵایە. پێهەڵگرتنی فێمینستی وێڕای سەرجەم کەموکوڕیەکانی بە رادەی کۆمەکەکەی بۆ بزووتنەوەی ژن بەهادارە. خودی مۆدێرنیتەی دیموکراتیش بەتایبەتی راستی ژن شیکار دەکات و خۆی دەکات بە حەقیقەت. لەپاڵ ئەوەشدا بەجۆرێک نزیک دەبێتەوە تا رەخنەکانی بزووتنەوەی فیمینستی بکات بە بەشێکی دەست لێبەرنەدراوی خۆی. کە دەڵێین بەش لەوانەیە لەجێگای خۆیدا نەبێت، ژنی ئازادیخواز وەک فاکتەرێکی سەرەکی ژیانی تەڤلی سیستەمەکەی دەکات.

## بەشی دووەم

### ١. لە شۆڕشی دیموکراتیزەکردنی ڕۆژهەلاتی ناویندا ژن پێگەیەکی تایبەتی هەیە.

ژن جێگایەکی ڕەسەن و تایبەتی لەناو ڕابوونی دیموکراسییانەی ڕۆژهەڵاتی ناوین هەیە. وەکو هێزی خوڵقاندنی شۆڕشی نیۆلیتیک، ناتوانێ بە هیچ جۆرێک ڕەوشی بچووککردن و بەلاوەنانی لەلایەن کۆمەڵگای چینایەتییەوە هەرس بکات. بەردەوام بە گومانەوە تەماشای سەرداری پیاوی کردووە. باش هەست بە زەوتکراوی مافەکانی دەکات. بێچارەییەکەی لە نێو ئێش و خەم و پەژارەیەکی ئێجگار زۆری هێشتۆتەوە. دەرک بەوە دەکات هیچ کاتێک شایستەی ئەمڕەوشە نەبوو کە تێیکەوتووە. لە ڕاستیدا بە ئەهێنی لایەنگری کولتووری خوداوەندی ژنە و پەیڕەوی دەکات. هیچ کاتێک لە دڵەوە باوەڕی بە خوداوەندە پیاوەکان نەهێناوە. ئەوەش دەزانێ کە بەردەوام لە نێو بۆشاییەکدایە. پڕ بە ئێش و تووڕەبوونەوە هەست دەکات ئەو خۆشەویستی و ڕێزەی بەرامبەر نیشان نەدراوە کە شایستەیەتی. هەرگیز لەوەی نەبووریوە کە بەمجۆرە بکەوێتە ڕەوشێک هێندە پێویستی بە پیاو بێت؛ زیاتر لە خۆی نەبووریوە. دەزانێ پیاو زۆر لە خۆشەویستی دوورە، دڵڕەقە و بێڕەوشتە، لە هێزی ئەشق بێبەشە. بوونی بە قوربانی تەواوی ئەم ناکۆکییانە بە پێچەوانەی مەزەندەکانی ژن بەرەو نەزانی نابات، بەڵکو زیاتر لە بلیمەتی نزیک دەکاتەوە. کاتێک باوەڕی دێنێ، هیچ هێزێکی دیکە ناتوانێ ببێتە ڕێگر و نەهێڵێ پێداویستیەکانی باوەڕهێنانی خۆی جێبەجێ بکات. بە گشتی تەواوی ژنان بە تایبەتیش ژنانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بە هۆی ئەو تایبەتمەندێتییانەیان زیندووترین و چالاکترین هێزی کۆمەڵگای دیموکراسییانەن.

سەرکەوتنی یەکجارەکی کۆمەڵگای دیموکراسییانە بەدەستی ژن بەدیدێت. ژنان و گەلان کە لە سەردەمی نیۆلیتیک بەولاوە لەلایەن کۆمەڵگای چینایەتی ژێرخاککراون، وەکو خاوەنی ڕاستەقینەی هەڵمەتی دیموکراسی، هەم تۆڵەی خۆی لە مێژوو دەسەنێتەوە، هەم لەمیانەی چەسپاندنی ڕەوتی چەپڕەوی شارستانیەتی دیموکراسییانە دژە بیرۆکەی پێویست پێکدێنێ، لە ڕاستیدا لە چوون بەرەو کۆمەڵگایەکی یەکسان و ئازاد، پتەوترین کۆڵەکەی کۆمەڵایەتی پێکدێنن. چونکە دیموکراتیزە بوونی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوین و بوونی بە دەزگا و بیرۆکە، زیاتر لە سایەی ژنان و دواتریش گەنجانەوە بەدیدێت. وشیاربوونەوەی ژنان وەکو هێزی پێشەنگی کۆمەڵگا و جێگرتنی لە شانۆی مێژوودا، بەهای دژە بیرۆکەیەکی ڕاستەقینەی هەیە. جیهانی ژنان و وشیاری و ویژدان و خۆشەویستییەکەی پاڵێوراوە بۆ خوڵقاندنی بەهای تایبەتی شارستانیەت. پێشکەوتنی پیاوسالاریانەی شارستانیەت کە وەکو پێویستیەکی کەسایەتی و کارەکتەرەکەیانە، لەم بوارەشدا ژنان بەرەو ڕەوشی دژە بیرۆکەیەکی بەهێز دەبات. هەم بەلاوەنانی جیاوازیەکانی کۆمەڵگای چینایەتی، هەم کۆتاییهێنانی بە باڵابوونی پیاو لە دژە بیرۆکە بەولاوە، بەهای سەنتێزێکی نوێی هەیە. هەربۆیە ڕۆڵی پێشەنگایەتی ژنان لە وەرچەرخانی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوین بۆ کۆمەڵگایەکی دیموکراسییانە بۆ سەرتاسەری جیهان، بە واتای دژە بیرۆکە و سەنتێز دێت و تایبەتمەندێتی مێژوویی لەخۆوە دەگرێت.

هەم بەکۆمەڵگابوونی مێژوویی، هەم بەکۆمەڵگابوونی جوگرافی، پێویستە لەمیانەی پەیوەندییەکی چڕی دیالەکتیکی نێوانیان هەڵوەستە بەرامبەر ناوچەکە بکەن. تاوەکو هەر قۆناخ و پارچەیەکی کاتەکانی مێژوو و شوێنەکانی جوگرافیا شینەکرێنەوە، ناشێ لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان و تەواوی سیستەمەکانی شارستانییەت تێبگەین. مێژووی نەنووسراو لەمێژووی نووسراو گرنگ و بەبایەخترە. دیسان زیاتر لەو شوێنانەی بەردەوام ناویان دەهێنێرێ، چیرۆکی ئەو شوێنانە گرنگە کەباس نەکراون. ناوەکەی دیکەی دەسەڵات باوکسالاری، هیچ خانەو ئاستێکی کۆمەڵگا نەماوە دزەی بۆ نەکردبێ. لەوانەیە هەزاران ساڵ بەر لەدەزگای دەوڵەت دابونەریتی باوکسالاری کۆمەڵگای بەڕێوەبردبێ. هێزی باوکسالاری لەوانەیە لەهیچ شوێنێک بەئەندازەی ڕۆژهەڵاتی

ناوین هێزەکەی ئابلۆقەدەرو خنکێنەرنەبێت. ئێستاش وەک ئەو بەهایانەی لەئارادان کاریگەری هێزی باوکسالاری لەسەر کەسایەتی ژن و پیاو، کولتووری ئەتنیکی، خێزان و چەمکی نامووس زۆر دیارو بەرچاوە. پێویستبوو شارەکان کولتووری بەرامبەر پێشبخەن، بەڵام بەهۆی ناوچە لادێییەکان بەقووڵی شوێنپەنجەی باوکسالارییان پێوەیە. لەنێو ئۆقیانوسی ناوچە لادێییەکاندا شارەکان وەکو دوورگەیەک دەمێننەوە.

کێشەیەکی دیکەی بەلانی کەم هێندەی کێشەی دەوڵەت قورسبووە ئەو هەڵسوکەوت و زهنییەتەی کۆمەڵگایە کە لەدەوروبەری خێزان و ژن شێوەی گرتووە. لەسەرەوەدا دەوڵەت، لەخوارەوەش خێزان، وەکو دووالیزمی بەهەشت و دۆزەخ یەکێتییەکی دیالەکتیکی پێکدێنن. لەکاتێکدا دەوڵەت میکرۆمۆدێلی خۆی لەخێزان وەردەگرێت و پێکدێنێت، داواکاریەکانی خێزانیش کە لەگەورەبوون دایە ماکرۆمۆدێلی خۆی وەکو دەوڵەت وێنادەکات. هەرخێزانێک چارەسەری نموونەیی خۆی لەبەدەوڵەتبووندا دەدۆزێتەوە. رەنگدانەوەی دەسپۆتیزمی دەوڵەت لەخێزاندا "سەرۆکی خێزان" پیاوە، کەوەک" دەسپۆتێکی بچووکە" چەندە دەستڕۆییە گەورەکەی دەوڵەت هەوڵبدات لەمیانەی هەڵوێستە بەکاریگەرو دەستڕۆو ئارەزوومەندانەکەی خۆی خەڵک رێکبخات، سەرۆکە بچووکەکەش بەوە خەریک دەبێت هەمان سیستەمی رەهاگەرایی بەسەر چەند ژنێک و منداڵەکاندا پەیڕەوبکات.

پیاو و ژنانی رۆژهەڵاتی ناوین هێندە ئاڵۆزی و پەرتەوازەیی لەخۆوەدەگرن پێویستیان بەشیکردنەوەی تایبەت هەیە. شیکردنەوەیەکی لەچوارچێوەی قالبە گشتییەکانی سۆسیۆلۆژی سەبارەت بەخێزان، ژن و پیاوی دەسەڵاتدار ئەنجامبدرێت، کەموکورتی بەرچاو لەخۆوەدەگرێت. وشکترین و تاریکترین لایەنەکانی راستینەی سیاسی، ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی لەپیاوو ژندا رەنگدەداتەوە. ناکۆکییەکانی ناودەزگای خێزان لەناکۆکییەکانی ناودەزگای دەوڵەت کەمترنییە. خێزان واتاکەی لەوە زیاترە کەدەزگایەکی کۆمەڵایەتی بێت، هەروەکو بڵێی " کونی رەش" ی کۆمەڵگاکانە. کاتێک ژن بخەینە ژێر زەرەبینەوە، لەوانەیە بتوانین ئێش و ئازارو درامای تەواوی مرۆڤایەتی بخوێنینەوە.

تاوەکو لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا خێزان وەکو میکرۆمۆدێلی (نموونەی بچووکی) دەوڵەت شینەکرێتەوە، ئەوا ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی تۆکمە بۆ کۆمەڵگا زۆر بەناتەواوی دەهێڵێتەوە. ئەگەر ئەمڕۆ لەکۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین کێشەی ژن بەلانی کەم هێندەی کێشەی دەوڵەت قورس بوو بێت، ئەوا دیسان مێژووی کۆیلایەتی ژن لەژێرئەمەدا شاراوەیە. کەئەویش بەئەندازەی مێژووی دەوڵەت ئاڵۆزو درێژخایەنە. تاوەکو بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا سێکوچکەی بەرمۆدای ژن ـ خێزان ـ پیاو لەنەخشە نیشاننەدرێت، ئەوا نقوومکردنی هەرکەشتییەکی چارەسەری کۆمەڵگا کە بەتەنیشتی تێپەڕدەبێت زۆرسانایییە. سێکوچکەی بەرمۆدا لەئۆقیانووسی کۆمەڵگادا لەرۆژهەڵاتی ناوین خێزانە. کە لەهەمانکاتدا میکرۆمۆدێلی دەوڵەتە. لەکاتێکدا دەسەڵات و دەوڵەت هەڵدەکشێن، مسۆگەر تاوەکو شوێنکەوتەی خۆیان لەدەزگای خێزاندا نیشاننەدەن ناتوانن ئەوەی دەیانەوێ ئەنجامی بدەن. دەسەڵات و دەوڵەتێک کە لەناوخێزاندا رەنگنەداتەوە، ناتوانن شانسی ژیانی خۆیان بەهێزبکەن و بەردەوامی پێبدەن. ئەم دووالیزمە دیالەکتیکییە بەشێوەیەکی تایبەت و هەستیار لەشارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا دەستی بۆدەبردرێت و هیچ کاتێک پشتگوێ ناخرێت.

ژن وەکو چین، بنەچەو رەگەز خراوەتە نێو کۆنترین زنجیرەی دیلێتییەوە، تاوەکو تاوتوێ نەکرێت و بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت نەخرێتە ژێر شیتەڵکردنێکی سۆسیۆلۆژی، ئەوا کەموکورتی مەزن دەبێت لەدەرککردن بەخێزان و پیاو، بەواتایەکی دیکە دەوڵەت و کۆمەڵگا. بەکورتی پێویستە مێژووی کۆیلایەتی ژن بنووسرێتەوە. لەبەرئەوەی لەبەشەکەی پێشووتر هەوڵمدا ئاماژە بەپێناسەی ژن بکەم لێرە دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام دیسان لەکاتی هەنگاونان بەرەو بەکۆمەڵگابوون لەبواری بایۆلۆژیدا نیشاندانی ژنان وەک رەگەزێکی ناتەواوو بەکەموکورتی تەواو هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژییە ـ تێڕوانینێکی زهنییەتی پیاوسالارییە ـ هەربۆیە نابێ پشتگوێ بخرێت. بەپێچەوانەوە هیچ کاتێک نابێ ئەوە لەبیربکرێ کە لەبواری زانستی سەلمێزاوە ژن وەکو هەبوونێکی کۆمەڵایەتی و بایۆلۆژی تۆکمەترە.

ناوەندی کولتووری دایک ـ ماڵیکردن ڕۆژهەڵاتی ناوینە. ئەو بەڵگانەی لەدەستدان نیشاندەدەن کەئەم کولتووره لەساڵانی ١٥٠٠٠ ی پ.ز لەنێو پێشکەوتندا بووه. هەبوونی ئاژەڵ و دانەوێڵە لەبناری ناوەوەی زنجیره چیاکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس تواناکاریه سەرەکییەکان بۆ ماڵیکردن دەڕەخسێنێ. لەباری پێکهاتەی خاک و کەش و هەوا بۆ ڕووەک و بەخێوکردنی ئاژەڵی بچووکی وەکو مەڕو بزن ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێ.

پێویستیەکانی ژن لەمنداڵبوون و بەخێوکردن تەنیا لەهەلومەرجی شوێنی جێگیردا بەئاسانی بەدیدێت. کاتێک کەشێکی گونجاو، هەبوونی ئاژەڵ و ڕووەک لەگەڵ ئەم پێویستییە دەبن بەیەک، هەلومەرجە بنچینەییەکانی ماڵیکردنی دێتەئاراوە. هونەری کۆکردنەوە، هەبوونی چەندین جۆری ڕووەک و میوە دەتوانێ پێویستییەکانی خواردن دابین بکات. ماڵیکردنی مەڕو بزنی شاخ، دابینکردنی پێداویستییەکان لەڕێگای خوری، شیرو گۆشت دەوڵەمەندتردەکات. لەڕێگای ئەزموون و تاقیکردنەوەکان بینراوە کەپێگەیاندنی دانەوێڵەو دارەبەپیتەکان لەوشوێنەی وەکو کێڵگەیە ڕێگا لەپێش چەندین جار زیادبوونی بەرهەم دەکاتەوە. لەجیاتی ئەوەی یەکسەر ئاژەڵ بکوژن، بەخێوکردنی زۆر گونجاوتربووە بۆئەوەی لەسەرماو نەبوونیدا برسی نەمێنێ و سوود لەبەرهەمەکانی شیرو خوریەکەی ببینێ. ژن ـ دایک لەگەڵ ئەو منداڵانەی لەدەوروبەری خۆی گەورەی دەکات. بۆ پێشخستنی سیستەمی ماڵیکردن لەهەردوو بواریشدا خاوەنی ئەزموونی بەهێزە. لەوانەیە دەرکەوتن لەئەشکەوت و پێگەیاندنی بەرهەمی گونجاوو ئاواکردنی ماڵ لەوشوێنانەی ئاژەڵی لێ بەخێودەکرێت کارێکی سادەو سانایی دیاربێ، بەڵام هەروەکو چوونە سەرمانگ ڕۆڵێکی مەزن لەمێژوودا دەبینێ. دروستکردنی گوند لەکوخە بچووکەکان هێندە زەحمەت نابێت. ئەو مێژووەی بۆ ساڵانی ١١٠٠٠ ی پ.ز درێژ دەبێتەوە ئەمڕۆ لەزۆر شوێنەکانی کوردستان وەکو، دیاربەکر، ئەرگانی، چیای ئۆنو: باتمان، چەمێ خەلان: ئورفا، نەڤالاچۆلێ و گۆبەکلی تەپە، برادۆست، ماغ ـ پاشماوەکانی ئەم کولتووره دەبینرێ. لەهیچ شوێنێکی جیهان شوێنگەی کولتووری نیشتەجێبوون نابینرێ، کە لەوە کۆنتربێت. سەرەکیترین بەڵگەکانی بڵاوبوونەوەی کولتووری دایک ـ ماڵیکردن لەم ناوچانە نیشاندەدات ئەو پەیکەرانەن کەهەموویان لەوێنەی ژنن. هەروەها دەتوانرێ مۆرکی ژنان لەپێکهاتەی زمانی ناوچەکان وەک نموونە نیشانبدات. لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا کاتێک هەمان کولتوور بواری کارامەیی ژنانە ئەوا ئەم ڕاستینەیە پشتڕاست دەکاتەوە.

سەرچاوە سۆمەریەکان ئەوە نیشاندەدەن لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتشاردا بۆیەکەمین جار ئەم کولتووره بەکاریگەربووەو بەشێوەیەکی بەهێز درێژەی بەهەبوونی خۆیداوە. ئەو پەردە میتۆلۆژییە چنراوەی لەدەوروبەری ژنەخوداوەند ئینانا ـ خوداوەندە ژنی ئورگ ـ ئەزموونبەخشە. بەتایبەتی بەرخودانی لەبەرامبەر هەڵکشانی باڵادەستی پیاو گەوهەرێکی وەهای هەیە کەتۆکمەترین بزووتنەوەکانی فێمینزمیش پێینەگەیشتوون. بەرامبەربەخوداوەند ئەنکی بەشێوەیەکی بەهێز پارێزگاری لەوەدەکات کەژن خاوەنی کامە شارستانییەتە. بەزمانێکی شیعرئامێزانە باس لەوەدەکات کەخۆی خاوەنی ١٠٤ "ما"کانە، ئەنکی بەفێڵبازی لێیدزیوە، بۆیە پێویستە بیداتەوە. ئەم باسە میتۆلۆژییە کەبۆ٣٠٠٠ ی پ.ز دەگەڕێتەوە، لەڕاستیدا بەشێوەیەکی بەرچاو ڕۆڵی ژنان لەدوای شارستانییەتی سۆمەری نیشاندەدات، هەروەها ئینانا لەڕیشەوە بەکۆنە ژنەخوداوەندی شاخ "نینهورساک" گرێدەدرێت. لەبواری ئەتیمۆلۆژی (زمانناسی) نین= ژنەخوداوەند، کور= شاخ، ساک = ناوچە، ئەمەش بەواتای ژنە خوداوەندی ناوچەی شاخاوی دێت. بەگوێرەی ئەوەی کە لەخوارووی میزۆپۆتامیا باس لەشاخ بکەیت زنجیرەی زاگرۆس و بەردەوامییەکەی بەئەنەدۆڵدادێت، ئەوا ئەوەروونەدەکاتەوە کەکولتووری ژنەخوداوەند لەناوچە شاخاویەکانەوە بۆ خوارەوە گواستراوەتەوە.

لە ماوەی نێوان ٤٠٠٠ ـ ٢٠٠٠ ی پ.ز لەناوەندی شارستانییەتی جیهان واتە لای سۆمەریەکان هێشتا کولتووری ژن ـ دایک بەکاریگەرە شانبەشانی پیاو خاوەن قورساییە. لەتەواوی بەڵگە میتۆلۆژیەکانی پەیوەست بەم قۆناخە بەقورسایی ڕەنگیداوەتەوە. پەرستگاکانی ژنەخوداوەندە بەربڵاون. هێشتا لەدەوروبەری ژن کولتووری عەیبداری پێشنەکەوتووە. بەتایبەتیش کرداری زایەندی وەکو چالاکییەکی خودایی باسدەکرێت. عەیبداری لەولاوە بمێنێت، چیرۆکی ئەدەبی وەها جێگای باسە تەنانەت لەڕۆمانەئەرۆتیکە بژاردەکانیش نابینرێ. هەرچالاکی و هەڵسوکەوتێکی پەیوەندی بەزایەندەوە هەبێت، وەکو بەهادارکردن و جوانی ژیان واتای پێدەدرێت. هێشتا هیچ عەیبداریەک سەبارەت بەژن لەئارادانییە کەدواتر لەمیانەی شێوازی ژیانی دژەشۆڕشگێڕی پێشدەخرێت.

جەستەی ژن بەردەوام بابەتی پیاهەڵدانە. هەرچەندە مەراسیمی هاوسەرێتی پیرۆز چەواشەکرابێت ـ بوویێتە چالاکی پیسکردن ـ بەڵام پاشماوەی ئەم قۆناخەیە. داستانی "مەمی ئالان"، "مەم وزین" و "دەروێشی عەبدی" کە تائێستا لەکوردستاندا باسدەکرێن چەندین لایەنی پەیوەست بەپەیام و بابەتەکەی شوێنگەی بەهێزی ژن نیشاندەدات. ئاماژە بەوەدەکرێ کەیەکەمین نموونە رەسەنەکەی ئەم داستانانە بۆسالآنی ٤٠٠٠ ی پ.ز دەگەڕێتەوە.

لە هۆنینەوەی میتۆلۆژیای "ئینانا" هەم پیاوی ـ شوانکار، هەم پیاوی ـ جووتیار وەکو یارمەتیدەر نیشاندەدرێن. دوموزی شوانکارو ئەنکۆمدی جووتیار بۆنیشاندانی رێزو گرێدانیان بەرامبەر ئینانا لەپێشبڕکێدان. بۆبوون بەیارمەتیدەری سەرەکی هیچ کارێک نامێنێ نەیکەن. هێشتا ئینانا لەرەوشی پێشەنگێکی بەرچاودایە. وەک جووتیارو شوانکار پیاو زۆر لەوەدوورە ببێ بەباڵادەست. لەداستانی بابلی "ئەنومائەلیش" کەداستانێکی دیکەی بەناوبانگی سۆمەریەکانە، دەبینین رەوشی پێچەوانە بۆتەوە. دووالیزمی خوداوەند ماردۆک کەنوێنەرایەتی پیاوی خاوەن هێزی نائاسایی دەکات لەگەڵ تیامات کەنوێنەرایەتی ئەودایکە دەکات کەهێزی لەبەربڕاوە، دووالیزمێکی ئەزموونبەخشە. سەبارەت بەژنەخوداوەندو ژن ـ دایک هەڵمەتێکی رەشکردن و کولتووری عەیبدارکردن بەڕێوەدەچێت. بۆئەوەی ژن وەک بێڕەوشت، بێسوود، زیانبەخش و مەترسیدار نیشانبدەن هێندەی بکرێ قاڵبە میتۆلۆژیەکان تەنگەتاودەکرێن. دەبینین لەسالآنی ٢٠٠٠ ی پ.ز بەدواوە ئەم کولتوورە بڵاودەبێتەوە. لەسیستەمی کۆمەڵگا گۆڕانکاریەکی مەزن دژی ژن هاتۆتەئاراوە. کۆمەڵگای باوکسالاری لەو هێزدایە باڵادەستی خۆی بکاتە داستان. لەکاتێکدا هەرشتێکی پەیوەندی بەپیاوەوە هەیە بەشکۆمەندی و قارەمانی نیشاندەدرێن، هەرشتێکی پەیوەندی بەژنەوە هەبێت بچووک دەکرێنەوە، وەک عەیبداری و بێنرخ نیشاندەدرێت.

شکاندنەوەیەکی رەگەزی وەها دێتەئاراوە کە لەمێژوودا رێگا لەپێش گەورەترین گۆڕانکاری ژیانی کۆمەڵگا دەکاتەوە. دەتوانین ئەم یەکەمین گۆڕانکارییەی لەرۆژهەڵاتی ناوین پەیوەست بەژن دێتەئاراوە بە"یەکەمین شکاندنەوەی رەگەزی مەزن" ی بەناوبکەین کەشۆڕشی چەواشەیە. دەڵێین شۆڕشی چەواشە (دژەشۆڕش) هەربۆیە کاریگەری ئەرێنی لەسەرگۆڕانکاری کۆمەڵگا نییە. بەپێچەوانەوە باڵادەستی وشک و توندی کۆمەڵگای باوکسالاری هێناو لەمیانەی لاتەریککردنی ژنان رێگای لەپێش جیاوازییەکی مەزنی ژیان کردەوە. لەجیاتی کۆمەڵگایەکی دوودەنگی، رێگای لەپێش کۆمەڵگای یەکدەنگی پیاو کردەوە. لەوانەیە ئەم شکاندنەوەی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین یەکەم هەنگاوی سەراوژێربوون بوویێت. لەگەڵ تێپەڕبوونی قۆناخە جیاوازەکان ئەنجامەکانی تاریکتر بووە. هەنگاو بۆنێو کولتووری کۆمەڵگای پیاوسالاری بەزێدەڕۆیی و یەکلایەنە نراوە. لەکاتێکدا ژێری سۆزداری و زیندووی ژن ونبوو کە لەقوناخێکدا سەیروسەمەرە (عجائب)ی خوڵقاندو تادواڕادە مرۆ ڤیەروەرانەبوو؛ لە ژێری وشک ـ ئەنالیتیک ـ کولتوورێکی ستەمکار لەدایکبوو کەتەسلیمی دۆگماتیزم بووە، لەسروشت دابڕاوە، شەڕ بەگەورەترین مەردایەتی لەقەڵەمدەدات، چێژ لەرشتنی خوێنی مرۆڤ وەردەگرێت، هەمووجۆرە هەڵسوکەوتێکی ئارەزوومەندانە لەگەڵ ژن و پیاوی بەکۆیلەکراو بەماف دادەنێ. ئەم ژێرییە یاخود ئەمجۆرە هزرکردنە پێکهاتەیەکی پێچەوانەی ژێری ژنی هەیە کەیەکسانیخوازەو وابەستەی سروشتی زیندووو بەرهەمی مرۆڤدۆستانەیە.

لەدوای هەڵکشانی پێکهاتەی پیاوسالاری دەبینرێ کەخوڵقکاری کۆمەڵگا دووچاری بەستەڵەکیی و بنبەستبوونێکی جددی هاتووە. لەکاتێکدا لەقۆناخی نێوان ٦٠٠٠ ـ ٤٠٠٠ ی پ.ز (قۆناخی دایک) بەهەزاران داهێنان ئەنجامدران، لەدوای سالآنی ٢٠٠٠ ی پ.ز دەبینرێ کەژمارەیەکی زۆر سنوورداری داهێنان هەن کەجددی و بایەخدار ببینرێن. لەتەنیشت ئەمەش پێکهاتەیەک هاتەئاراوە کەکولتووری دەسەڵات ـ جەنگاوەری تێدابڵاوبۆوە، فەتحکاری بەشکۆدارترین پیشە لەقەڵەمدرا ـ پیشەی پادشاکان ـ و ئامانجی سەرەکی دەوڵەتەکان بوو بەفەتح. بەپووختی بەلاوەنانی ژن و بەهاو نرخدانێکی مەزن بەدەسەڵاتەکانی پێکهاتەی پیاوی فەتحکار ـ جەنگاوەر لەناویەکدا بەڕێوەچووە. لەکاتێکدا دەزگای دەوڵەت بەتەواوی وەکو دۆزینەوەیەکی پیاو واتادارببووە، شەڕەکانی بەئامانجی تالآن و دەسکەوت ئەنجامدراون، بووە بەشێوازێکی بەرهەمهێنان. لەجیاتی چالاکی کۆمەڵایەتی ژنان کەپشت بەبەرهەمهێنان دەبەستێ، هەنگاو بۆ ئەو چالاکییە کۆمەڵایەتیانەی پیاونراوە کەپشت بەشەڕو دەسکەوت (غەنیمەت) دەبەستێ. پەیوەندییەکی نزیک لەنێوان دیلێتی ژن و کولتووری کۆمەڵگای جەنگاوەری هەیە. شەڕ بەرهەم ناهێنێ، قۆرخ دەکات،

تالان دەکات. هەرچەندە رۆڵی توندوتیژی لەهەندێ هەلومەرجی تایبەتدا ـ کردنەوەی ڕێگای ئازادی، بەرەنگاربوونەوەی داگیرکاری و دەستدرێژی و چەوسانەوە ـ لە پێشکەوتنی کۆمەڵگادا رۆڵی دیاریکراوی هەبێت، بەڵام بەزۆری رووخێنەرو نەرێنییە. کولتووری توندوتیژی کە لەناواخنی کۆمەڵگا جێگیربووە، لەرێگای شەڕەکانەوە تێرخۆراک دەکرێت. لەنێو دەوڵەتاندا شمشێری شەڕ، لەناو خێزانیشدا دەستی پیاو پەیکەری بالادەستین. هەم کۆمەڵگای ژێر هەم ئەوەی ژوور لەنێو بەرداشی شمشێر و دەست دان. بەردەوام بەشانوباڵی کولتووری زاڵبووندا هەڵدەدرێت. گەورەترین کەسایەتییەکان ئەو شانازیکردن و پیاهەڵدانەی لەئەنجامی خوێنڕشتێنکی بەناهەق بەرامبەریان نیشاندەدرێت، بەگەورەترین و بەهێزترین مەردایەتی و رەوشت بەرزی لەقەڵەم دەدەن. بەتایبەتیش پادشاکانی ئاشوورو بابل دروستکردنی کۆشک و قەڵاو شورا لەکەللەسەری مرۆڤ و نموونەکانی دیکە بەگەورەترین شان و شەوکەت و شەرەف لەقەڵەمدەدەن. کولتووری توندوتیژی ناوکۆمەڵگاو تیرۆری دەوڵەت کەئەمرۆش بەربڵاو سەرچاوەی خۆی لەم کولتوورە وەردەگرێت.

لە مێژووی ئایینە تاکخوداییەکاندا لەدەوروبەری ژن کولتووری "دووەمین شکاندنەوەی مەزنی رەگەزی" دێتەئاراوە. کولتووری شکاندنەوە لەقۆناخی میتۆلۆژی، ئەمجارە وەک فەرمانی خودا دەبێتە یاسا. شێوەی پەیوەندی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ ساراو هاجەر نیشاندەدات کەئایینی نوێ بالابوونی پیاو ئەرێ دەکات. باوکسالارێتی بەتەواوی جێگربووە. دەزگای کەنیزەک (جاریە)ی پێکهاتووە. هاوسەرێتی لەگەڵ چەندین ژن، واتە ـ فرەژنی ئەرێ دەکرێ. پەیوەندی توندی حەزرەتی موسا لەگەڵ خوشکەکەی مەریەم، نیشاندەدات کەبەشی ژن لەمیراس وەرگرتن هەڵگیراوە، نەماوە. کۆمەڵگای حەزرەتی موسا تەواو کۆمەڵگایەکی پیاوانە. هیچ ئەرکێک بەژنان ناسپێردرێ. هۆی کێشمەکێش لەگەڵ مەریەم بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. گووتەی " نابێ ژنی دەست بەهەویر خۆی تێکەڵی کاری پیاوان بکات"، لەو رۆژگارەوە بۆمان ماوەتەوە.

لە شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناویندا دیاردەی ژن سەنتەری چارەسەرکردنی تەواوی کێشە کۆمەڵایەتییەکانە. بەبێ دووبارەکردنەوەی پووختە مێژووی گەشەکردنی دروشمی سەرەکی قۆناخی داهاتوومان، ئەمجارە پێویستە "سێیەمین شکاندنەوەی مەزنی رەگەزی" دژی پیاوبێت. تاوەکو یەکسانی رەگەزی کۆمەڵگا بەدینەیەت، هیچ داواکاریەکی ئازادی و یەکسانی واتادارنابێ و دەستەبەرناکرێت. بەرفراوانترین و هەمیشەییترین فاکتەری دیموکراتیزەبوون دیسان ئازادی ژنە. ئەو سیستەمەی سەرەتا ژنی کرد بەموڵک، لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا بەهەمووشتێکیەوە کردوویە بەکالا، لاوازترین لایەنی دیسان کێشەی ژنە. رۆڵی ئەودیاردەیەی لەقۆناخێکدا چینی کارکەری پێدەگووترا، بەباشترین شێوە رەچەڵەکی ژن ئەنجامیدەدات. بەرلەچینایەتی پێویستە شیتەڵکاری رەسەنێتی ژن بکرێت، تاوەکو باشتردەرک بەچینایەتی نەتەوایەتی بکرێت. ئازادییەکی راستەقینەی ژن بەلابردنی هەست و سۆزو ئیرادەی مێرد، باوک، برا، دۆست.. هتد بەدیدێت. باشترین ئەشق (ئەڤینداری) مەترسیدارترین موڵکایەتییە. تاوەکو تەواوی قاڵبە ئایینی و زانستی و هونەری و فیکرییەکانی جیهانی پیاوسالاری سەبارەت بەژن خوڵقاندوویەتی بەرەخنەیەکی چڕوپڕدا تێپەڕنەکرێت، ناسنامەی ژنی ئازاد دەرناکەوێتەڕوو. بەرلەهەموو شتێک پێویستە ژن ببێتە هی خودی خۆی، تاوەکو لەموڵکبوون رزگاری بێت. ئەوژنەی کەوتبێتە رەوشی موڵک و کرابێتە موڵک، دەبێتە رێگرلەپێش پیاوی مەردو رەوشتبەرزیش. هەستان و دانیشتن لەگەڵ ئەمجۆرە ژنە کۆسپە لەپێش پیاوی ئازادیش. ژنێکی خراوو داڕووخێنراوی بەمشێوەیە، ئەگەر بەپێچەوانە تاوتوێی بکەین، واتە پیاوی رووخێنراوە.

لە پادشایەتی عیبرانییەکاندا کەپێش سالانی ۱۰۰۰ ی پ.ز و دواتریش هەڵکشا، دەبینین کەلەگەڵ هاتنی داودو سلێمان هەنگاونراوەتە نێو کولتووری حەرەمسەرای فراوان. ژنان دەکرێن بەدیاری. هەنگاو بۆ قۆناخێکی نوێ نراوە کەدەنگی ژن کپکراوەو بۆری هەناسەدانی بڕدراوە. تەسەروفکردن لەسەر ژن هاوشێوەی تەسەروفکردن ـ خەرجکردنی هەر موڵکێکی دیکەیەو هیچ جیاوازییەکی نییە. ئەم رەوشەی لەدەوڵەتی ئایینی تازە لەئارادایە، کاریگەری و رەنگدانەوەی لەسەر خێزانیش دەبێت، ناشێ لەژێر بالادەستی جووتەی کولتووری باوکسالاری و کولتووری دەوڵەتی ئایینی باس لەرۆڵی ژن بکرێت. باشترین ژن ئەوەیە کە بەباشترین شێوە گوێڕایەڵی پیاوەکەی و باوکسالارێتی بکات. ئایینیش کراوەتە ئامرازی رەشکردنی ژن و چەواشەکردنی راستینەکەی. بەرلەهەموو شتێک "حەوا" یەکەمین ژنی گوناهبارە کە "ئادەم"ی تەفرەداو بووە هۆکاری دەرکردنی لەبەهەشت. لیلیت

کەکڕنۆشی بۆخوداوەندی ئادەم ـ شێوەی باوکسالاریتی ـ نەبرد، شەیتان بەبنەماددەگریت شێوەی ئەو مرۆڤەی کڕنۆشی بۆ ئادەم نەبردو بەندایەتی پەسندنەکرد ـ هاوڕێی شەیتانە. ڕەشکردنی میتۆلۆژی وەک نموونە دەبینرێ و بۆرەشکردنی ئایینی وەردەچەرخێنرێ. بانگەشەی سۆمەریەکان سەبارەت بەوەی گوایە ژن لەپەراسووی پیاو دروستکراوە لەپەرتووکی پیرۆزیشدا بەجێکراوە. ئەو پێخەمبەرانەی ژمارەیان بەهەزاران گەیشتووە تاکە ژنێکیشی تێدانییە. زایەندی ژن بەگوناهێکی گەورە لەقەڵەمدەدرێ، بەردەوام دووچاری ڕەشکردن و ناوزڕاندن دێت، بەسووک و نزم دەبینرێ و دەکرێت بەپەرەنسیپێکی نەریتی. ئەو ژنەی لەکۆمەڵگاکانی میسرو سۆمەر خاوەن شوێنگەیەکی شکۆداربوو ئیتر بابەتی عەیبداری و گوناهباری و تەفرەدانە.

کاتێک دەگەینە سەردەمی حەزرەتی عیسا، شێوەی مەریەم کەڕووبەڕوومان دەبێتەوە سەرباری ئەوەی دایکی کوڕی خوداوەندە، بەڵام بەخۆی هیچ پەیوەندییەکی بەخوداییبوونەوە نەماوە، کەوتن بەردەوامە. ژنێکی بآ دەنگی چاوبەفرمێسک جێی ناونیشانی دایکە خوداوەندی گرتۆتەوە. دووگیانبوونی لەئەنجامی فووتێکردنی خوداوەند ـ پیاوی باڵادەستی سەرژن ـ بیرۆکەیەکی پڕلەناکۆکییە. سێکوچکەی باوک ـ کوڕ ـ ڕۆحی پیرۆزی ئایینی مەسیحی لە بنەڕەتدا گوزارە لەسەنتێزێکی ئایینی فرەخودایی و تاکخودایی دەکات. لەم قۆناخەدا باوەڕی بتپەرستی و ڕۆحگەرایی کەپەیوەندییەکی چڕی لەگەڵ ئایینی مەسیحی هەبوو لەگەڵ باوەڕی وشکی تاکخودایی عیبرانییەکان ململانێییەکی بەرفراوانیان لەنێواندا هەبوو، لەئەنجامدا ئەم سێ مەیلە ڕێککەوتن، بوون بەخوداوەندی سێیانە، واتە ژمارەیان ئێجگار کەمبۆوە. لەسەردەمی حەزرەتی محەممەدیش سێکوچکەیەکی بەمشێوەیە بوونی هەبوو. بەجۆری ئایینێک شێوەی گرتووە. ئەوەی سەیرە، لەکاتێکدا بەلانی کەم پێویستە "مەریەم" یش خوداوەند بێت، وەک ئامرازێکی ڕۆحی پیرۆز دەبینرێ. ئەم دیاردەیە نیشاندەدات کەخوداوەند خاوەن مێشکێکی پیاوانەیە، بووە بەپیاو. لای سۆمەری و میسرییەکان خوداوەندە ژن و پیاوەکان تارادەیەک ژمارەیان وەک یەکە، یەکسانن. تەنانەت لە سەردەمی بابلیشدا هێشتا دەنگی دایکەخوداوەند بەهێزە.

ئەوەی لەرێگای حەزرەتی عیسا و مەریەم بەدیهاتووەو دەکەوێتە سەر ئەستۆی ژن، بوون بەدایکێکی هێمن و چاو بەفرمێسکە. ئەو هیچ کاتێک بۆنی خوداوەندێتی ناکات. زۆر بەباشی کوڕەکانی(کوڕی خوداوەند) بەخێو دەکات کە لەماڵن بەهادارن. لەبوون بەژنی ماڵ بەولاوە هیچ ڕۆڵێکی دیکەی کۆمەڵایەتی نییە. گۆڕەپانی گشتی بەتەواوی بەرووی ژناندا دادەخرێت. پراکتیکی عەزیزەکان (ژنی پاکیزە)ی ئایینی مەسیحی دۆخی گۆشەگێری ژنە لەپێناو ڕزگاربوون لەتاوانە گەورەکانی. ئەگەر شێوەیەکی سنووورداریش بێت دەتوانرێ بگووترێ ڕێگای لەپێش گۆڕانکارییەکی ئەرێنی کردەوە. بەلانی کەم عەزیزە گوزارەی ڕزگاربوونە لەعەیبداری و چەمکی زایەندی. هۆکارە ماددی و مەعنەوییەکانی بەهێزە بۆ پەسندنەکردنی ژیانی دۆزەخ ئاسای ماڵەوە. گومان لەوەدا نییە کەپراکتیکێکی مێژووییە. بەواتایەکی دیکە دەتوانرێ بەیەکەمین پارتی ژنە هەژارەکان بەناوبکرێت. بەشێوەیەکی زۆر داماڵراوو سڕاوەش بێت کولتووری ژنانی مانستەر (دێر) گوزارشت لەزیندووکردنەوەی کولتووری پەرستگای ژن دەکات. شوێنگەی پراکتیکی عەزیزە (ڕاهیبەژنەکان) لەمێژووی ئەوروپادا گرنگە. تارادەیەکی مەزن شیمانە دەکرێت هاوسەرێتی (خێزانی)یەک ژنی لەپراکتیکی عەزیزەکان ئیلهامی لێوەرگیرابێت. دەتوانین بڵێین سەرباری ئەوەی ژن لەژێر هەلومەرجێکی سەختدایە و (پاراستنی پەردەی کچێنی) پاکیزەیی وەک بینینی زایەندەکەیەتی بە سەرچاوەی هەڕەشە و مەترسی، دیسان ڕۆڵی هەبووە لەبەرزبوونەوەی ژندا. هەرچی لایەنی خراپەیەتی، شێوەی هاوسەرێتی کاسۆلیکی شارستانییەتی ئەوروپایە ـ کەنابێ تەڵاقی بدات ـ وەک پەرچەکردارێکەو ژن وەک کاڵایەکی زایەندی دەبینێ. بێگومان ئەمەش لەسایەی سەرمایەداری هەڵکشاوە.

سەرباری ئەوەی ئەو ستاتۆ نوێیەی ژن لەسایەی ئیسلامییەت و حەزرەتی محەمەد بەدەستیهێناوە بەگوێرەی فاکتەری کولتووری باوکسالاری هۆزەکانی بیابان هەندێ لایەنی ئەرێنی لەخۆوەبگرێت، بەڵام لەناوەڕۆکدا کولتووری عیبرانی بەبنەماگرتووە. ئەو ستاتۆیەی لەلایەن حەزرەتی داودو سلێمان سەبارەت بەژن شێوەی گرتووە چۆنە، لای حەزرەتی محەممەدیش هەمان شتە. دیسان فرەژنی ئامانجی سیاسی و ژیانی پڕ لەکەنیزەک (جاریە) بەڕەوا لەقەڵەمدەدرێت. هەرچەندە بە هاوسەرێتی لەگەڵ چوارژن سنووردارکرابێت، بەڵام لەناوەڕۆکدا هەمان شتە. چەمکی "ژن کێڵگەتانە، چۆن دەخوازن وەها بەکاریبێنن" ژنی بەموڵککراو وەک پێدراو تاوتوێ دەکات. چەمکی حەزرەتی محەمەد سەبارەت بەئەشقیش سەرسوڕهێنەرە. لەپەنجا ساڵیدا ئەڤینداریەکەی لەگەڵ

**عائیشەی نۆساڵی، ئاستی بەرزی پەیوەنداربوونی حەزرەتی محەمەد بەرامبەر ژن نیشاندەدات. بەردەوام پەسندانی خەدیجەی ژنی یەکەمی ئەو گرنگییەیە کەبەژنی دەدات. بەگشتی بەرامبەرژن هەستیارە. بەڵام هێشتنەوەی حەرەم و کەنیزەکی وەک دەزگایەک دواتر لەناو چینی دەوڵەتدا زۆر خراپ بەکاردەهێنرێت.**

**لەدوای مردنی حەزرەتی محەمەد کاتێک حەزرەتی عائیشە خۆی خستە نێو شەڕی دەسەڵاتی نێوان خەلیفەکان دۆڕاندی. لەمیانەی ئێش و ئازارێکی مەزن دەرک بەبەهای ژنێتی دەکات، هەربۆیە دەڵێ " ئەی خودایە، لەجیاتی ئەوەی من وەکو ژن بهێنیە دونیا، خۆزگە بتکردبام بەتاتەبەرد"، هەر لەپەیوەندی نێوان موسا ـ مەریەم دیاریکراوە کەجێگای ژن لەدەسەڵاتدا نییە. لەرۆژهەڵاتی ناوینی دەرەبەگایەتی چاخەکانی ناویندا گۆڕانکاریەکی ئەرێنی سەبارەت بەشوێنگەی ژن رووی نەداوە. دیسان قاڵبە مێژووییەکان بەرێوەدەچن. لەپەیوەندی ئەڤینداری کە لەنێوان لەیلاو مەجنون کراوە بەسەمبۆل ئەنجامێکی ئەرێنی دەرناکەوێت. لەدەرەبەگایەتیدا جێگای ئەشق نییە. لەناو ئەو خێزانەی لەژێر پێشبڕکێتی باوکسالارێتی و دەوڵەت دایە، ژن لەنێو قۆناخێکدا دەژی کە لەبەرزترین ئاستی نەبوونی کەسایەتی دایە. دیلی رەهای ئارەزووی خاوەن دەسەڵاتەکانە. بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانیان بەتەواوی رۆڵی ئامراز دەبینێت. بەشێوەیەکی گشتی بەداتاشراوی لەکۆمەڵگا جیاکراوەتەوە. لەو کۆمەڵانەی هێشتا لەنێو هەلومەرجی رەوەندیدا دەژین، ئەو ئاسەوارانەی لەسیستەمی کۆمۆنەی سەرەتاییدا ماوەتەوە رێزگرتنی ژن لەخۆوە دەگرێت، بەڵام قووڵترین کۆیلایەتی ژن لەناو ژنانی شارەکاندا لەئارادایە.**

**پێبەپێ پێناسەکردنی شوێنگەی ژن لەژێر سیستەمی موڵکایەتی و باڵادەستی ئاستەم دەبێت. وەک پێدراوێکی پەیڕەوی هەزاران ساڵە لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ژن لەنێو رەوشی وێرانەو رووخاویدا دەژیت. تەنانەت کاریگەی لەخشتەبردنی سیستەمی سەرمایەداری دوورە لەوەی بەتەواوی رەنگیدابێتەوە. توخمی سەرەکی ناوەندی پاشڤەڕۆیی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوینە. پیاوی رۆژهەڵاتی ناوین کە لەهەموو بوارێکدا دۆڕاوە، کاریگەری و تۆڵەی ئەم دۆڕاندنانە لەژن دەسێنێتەوە. لەدەرەوە چەندە دووچاری سووکایەتی ببێت، باجەکەی لەژن دەسێنێت، ئینجا ئەمە بەئەنقەست بێت یاخود لەخۆیەوە پێشبکەوێت. ئەو پیاوەی لەئەنجامی نەتوانینی پاراستنی کۆمەڵگاو نەدۆزینەوەی رێگای ئازادبوون پڕدەبێت، لەناو خێزاندا وەکو هێرشی بەسەر منداڵ و ژندا دەکات، توندوتیژی خۆی بەسەریاندا دەڕێژێ. لەراستیدا دیاردەی " تاوانەکانی ناموس" بەپێچەوانەوە چالاکی دەرخستنی رق و کینەی پیاوە بەسەر ژندا، ئەو پیاوەی کە لەهەمووبوارەکانی کۆمەڵگادا ناموسی خۆی ژێرپێخستووە. بەشێوەیەکی سەمبۆلیانە، بەڵام لەمیانەی نمایشیکی زۆر هەرزان و لەناوبەر وابیر دەکاتەوە کەدۆزی ناموسی چارەسەرکردووە. جۆرێکی تیمارکردنی دەروونی پەیڕەو دەکات. مێژووو دۆزێکی کۆمەڵایەتی لەدەستدراو لەژێر ئەم کێشەیەدا شاراوەیە. یەکێک لەکێشە هەرە سەرەکییەکان ئەوەیە کەئەم پیاوە رووبەرووی ئەم کێشە کۆمەڵایەتی و مێژووییە بکەیتەوە تێبگەیەنی و پێی پەسندبکەی کەتاوەکو بیری لێنەکاتەوەو لەبارەیەوە هزر پێشنەخات، هەرگیز لەپیسبوونی (خراپبوونی) ناموس رزگاری نابێت. دەبێ ئەوە فێربین و پەیڕەو بکەین کەناموسی راستەقینە لەپاکیزەیی ئۆرگانی زایەندی ژندا نییە، بەڵکو لەبەدەستهێنانی پاکیزەیی مێژوویی و کۆمەڵایەتیدا تێپەڕدەبێت.**

**لەو باوەڕەدام لەمیانەی ئەم پووختە مێژووییەی ئاماژەمان پێیکرد باشتر روونبۆوە کەئەو کێشانەی لەناو خێزانی رۆژهەڵاتی ناوینی ئەمڕۆ لەئارادایە بەئەندازەی کێشەکانی دەوڵەت گرنگ و بایەخدارن. فشاری دوولایەنە گرفتەکە دژوارتر دەکات. کاریگەریەکانی کۆمەڵگای دەوڵەت و باوکسالارێتی کە لەمێژووەوە هاتوون لەگەڵ کاریگەریەکانی قاڵبە هاوچەرخەکانی شارستانییەتی رۆژئاوا، لەجیاتی خوڵقاندنی سەنتێز، گرێکوێرە دروستدەکەن. ئەو بنبەستبوونەی لەدەوڵەت هاتۆتەئاراوە، لەخێزاندا دەبێت بەگرێ. پەیوەندیەکانی فرەژنی و زۆری منداڵ لەبواری ئابووریدا رێگانادات خێزان لەنێو رەوشێکی بەردەوامبووندا بێت. لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکان، گەنجان ناتوانن ئیش بدۆزنەوە، ئەمەش خێزان لەپەلوپۆ دەخات. خێزان کەبەگوێرەی پێوانەکانی ئابووری و دەوڵەت ئامادەکراوە، لەهەردوو لایەنەوە، ئیتر لەمیانەی شێوازی کۆنی پەیوەندیەکان بەرێوەناچێت و لەنێو چەقبەستندایە. نەخێزانێکی شێوازی رۆژئاوا، نەخێزانی شێوازی رۆژهەڵات، هیچ یەکێکیان لەئاراد نییە. داڕووخانی خێزان لەنێو ئەم هەلومەرجانەدا دێتە ئاراوە. بەبەراورد لەگەڵ ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی خێراتر**

**منداڵان و بەساڵاچووان و هەندێ ژنانی ئاسایی باس لەژیانی پەنابەری بکرێ. دەشێ دانیشتوانی کامپی مەخموور وەک پەنابەر پیناسەبکرێن. بەڵام توانەوە لەناو کوردەکانی باشوور خزمەت بەخۆیان و گشتیش ناکات. ئەگەر ئێمەش ژیانی پەنابەریمان لەسوریا پەسند بکردایە، دووچاری ئەم رەوشە نەدەبووین. نازانم ئەم خاڵانە باسکراوە یاخود نا، بەڵام بۆچوون و رەفتارەکانمان سەبارەت بەبابەتە هاوشێوەکانی ئەمە دەزانرێ. گوێڕایەڵیکردنی دیسیپلینی کۆنگرەی گەل لەلایەن عوسمان و گروپەکەی کە لەگەڵیدایە تاکە رێگای کەرامەت و شەرەفمەندییە. ئەنجامی هەنگاونان بۆ ئەو هەڵوێستانە دەزانرێ کەمامەڵەو سەودا بەنرخ و بەها رەسەنەکانی بزووتنەوەکەمان بکەن. خۆ چڕکردنەوەیان لەچواردەوری تیشکۆی سەرکەوتن لەهەموو لایەنێکەوە بایەخدارە. بەئەندازەی پەنابردنەبەر هێزە دەرەکییەکان، ئەوا هەڵوێستە خۆکوژییەکانیش پەسند ناکرێ، لەکاتێکدا لەم بارەیەوە، زانیاری تەواوم پێبگات دەشێ هەڵسەنگاندنی راستتر ئەنجامبدرێ.**

**دابڕان لەژیانی چڕبۆوەی تیشکۆی دەوڵەت و شارستانییەت دواکەوتن نییە، بەپێچەوانەوە دابڕانی بکوژانە لەسروشت، وازهێنان لەکەسایەتی زلکراوو پشتبەستوو بەخوێن و تەڵەکەبازی دەسەڵات، دەرفەتی گەیشتنە بەتەندروسترین شت. لەکۆمەڵگای نەخۆشەوە بۆ کۆمەڵگای تەندروست، لەکۆمەڵگای بۆش و بەخوریکەو دابڕاو لەژینگە، لەو کۆمەڵگایەی لەناو شارستانی ئەوپەڕگەری جۆرێک لەشێرپەنجەدایە، بۆ کۆمەڵگای ژینگەپارێزی؛ لەکۆمەڵگای دەوڵەتگەرایی کەلەسەروو تاخوار لەناو دەسترۆیی و تۆتالیتاریزمدایە ئاراستەگرتنێک بەرەو کۆمەڵگای کۆمەڵکاری دیموکراتیک و ئازاد ـ یەکسان جێگای باسە. رزگاربوون لەئەڵقەکانی زنجیرەی کوشتاری ئاژەڵانی کولتووری نێچیروانی، کوشتاری شارستانییەت بۆ مرۆڤ، کارەساتی سەرمایەداری سەبارەت بەسروشت لەوانەیە دەرگا لەمرۆڤایەتییەکی نوێ بکاتەوە. کەسایەتییەکی سیاسی ئەخلاقی کەلەگەڵ ئاژەڵان دۆستبێ، لەگەڵ سروشت ئاشتبووبێتەوە، پشت بەپێکهاتەیەکی هاوسەنگی ژیان ببەستێ، ژیانی پڕ لەئەشق، ئاشتیخوازو ئازاد ـ یەکسان بەبنەمابگرێ، هێزی زانست و تەکنۆلۆژیای ژێر گەمەکانی شەڕو دەسەڵاتی رزگارکردووە، بەلانی کەم هێندەی ئەو هێزەی ئەنکیدۆی بەشارو دەوڵەت بەستەوە، منیش راکێش دەکات و واتادار دەبێ. بەدڵنیاییەوە باس لەحەسرەتێک ناکەم کەبەندیخانەیەکی تاکەکەسی ئافراندبێتی. باس لەجیهانبینییەکی مەزنی هزری و دەروونی دەکەم. لەراستیدا بێزاربووم و نەفرەت لەو ژیانە زاخاوییەی چاوبەستکردن دەکەم کەخاوەن هەڵوێستی جیاکارییە، هێزی گەورە دەپەرستێ و لەژێر مۆرکی خوێنی تەواوی شارستانییەتەکان و سەردەمدا دەبریقێتەوە.**

**گلگامێشی پادشاش هەوڵیداوە جەنگاوەرە بەهێزەکانی خۆی لەناوچە شاخاوی و دارستانەکانی باکووری ئێراق (باشووری کوردستان)ی ئەمرۆمان کۆبکاتەوە. پێڕەوەکەی زۆر سەیرە، شاری ئورگ ژیانێکی نوێی دۆزیوەتەوە، عەنعەنەی ژیانی شار تادوارادە سەرنجراکێشە. ژنە سۆزانییەکان (سۆزانێتی ژن) لەسەرووی فاکتەرەکانی سەرنجراکێشیەوە دێت. راستتر ئەوەیە ئەو ژنەی لەپایەی خوداوەندە دایکی پیرۆز خراوەو وردەوردە ئەو ژنە ماوەتەوە کەلەسۆزانیخانە گشتی و تایبەتەکان داخراون، ژیانێکی ئارەزوومەندی ورمەکی لەسەر ئەو ژنانە بۆ پیاوان تابلێی سەرنجراکێشە. کۆیلە نوێکە (ژن) توانستێکی بێسنووری ژیانی ئارەزوومەندی پێشکەش دەکات. تێکۆشانی خوداوەندە ژنی ئورگ "ئینانا" بەرامبەر خوداوەندە پیاوی فێڵباز ئەنکی لەخۆڕا نییە. ئینانا (پێشتر لەشاخ ناوی نینهورساکە، ئەمەش بەواتای ژنەخوداوەندی ناوچەی شاخاوی دێت). نوێنەرایەتی دایکی ـ ماڵیکردن دەکات کەشارستانییەتی چاخی بەردینی نوێ (نیئۆلیتیکی) پێشخستووە. ناسنامەی ئەو کۆمەڵگایەیە کەلەدەوروبەری دایک کۆبوونەتەوە. بەهەرحاڵ بابەتێکی هەرەزێدە لەبەرامبەریدا بەرخۆدانی کردووە ئەوەبووە لەسۆزانیخانە گشتی و تایبەتەکان وەک کاڵا پێشکەش نەکرێ. لەبەر ئەم هۆکارەشە شەڕێکی مەزن دەکات لەپێناو پاراستنی پێگەی خوداوەندێتی. لەداستانەکەدا ژنی هەوەسبازی ناسراو وەک فاکتەری سەرەکی گرێدانی ئەنکیدۆ بەشاری ئورگ نیشاندەدرێ. ئەمەش هەڵوێستێکی جێگەی بڕوایە. ئەوەی ئەنکیدۆی بیانی لەکەناری ئاوەکە راودەکات هەمان ژنە. چەندەی ئەنکیدۆ بەژنانی شار گرێدراوە، ئیتر بووە بەباشترین فەرماندە ـ سەربازی گلگامێش. لەداستانی دواتردا بەردەوام وەک نموونەی یەکەم و نەمر باسی ئەزموون و بەسەرهاتی گلگامێش ـ ئەنکیدۆ دەکرێ.**

**کاتێک یەکەمین چوونی خۆم بۆ خوێندنگای سەرەتایی و شار لەگەڵ چیرۆکی ئەنکیدۆ بەراورد دەکەم. لەوە درەنگ نەکەوتم و تێگەیشتم کەداستان باسی منیش دەکات. لەم بارەیەوە باسکردنی بیرەوەرییەکی خۆم سوودمەندتر دەبێت، لەکاتێکدا منداڵانی دراوسێم هاندەدا بۆ خوێندنی سەرەتایی بچنە گوندی "جەبین"ی گەورە، یەکێک لەمانەش منداڵێکی بەناو شەوکەت بوو. برا بچووکی "جمۆ" بوو کەیەکەمین چالاکی گەریلاییم لەبەرامبەردا ئەنجامدا بوو. دایکی لەسەرووی ژنە هەژارو سەرەتاییەکانی گوندەوە دەهات. بەڵام ئەو شرۆڤەیەی لەرۆژی چوونی شەوکەوت بۆ قوتابخانە کردی، جۆرێک بوو لەهی پرۆفیسۆران دەچوو. ئێستاش لەبیرمە گووتی: ـ "شەوکەتمان بووە بەحکومەت" تەنیا من لەم دوا بەرگرینامەیەمدا توانیم بەباشی واتای ئەم گووتەیە شی بکەمەوە.**

**ئیتر هەموومان وەک ئەنکیدۆ کەسایەتییەک بووین کەبەدوای شارو دەوڵەت راماندەکرد. لەکۆمەڵگای دایک دادەبڕاین، چەندەی دەچوو بەرامبەر بەبالابوونی شار گوندمان بەبچووک دەبینی، چەندەی دەچوو گوندەکەمان دەسڕایەوە، چەندەی دەچوو دایکمان گرنگی و بایەخی نەدەما، پەیوەندییەکانی تیرەو بنەماڵەمان بچووک دەبینی، شار ئەو دەوڵەتەی پێشمان وەک موگناتیس ئێمەی رادەکێشا. ئیتر رزگاربوون لەکاریگەرییەکانی سانایی نەبوو، شارو دەوڵەت خۆی لەخۆیدا ئامرازێکی ترسناکی پروپاگەندەیە، هەروەکو بڵێی هەموو شتێکی شار بەشێوەیەکی زۆر جوان و سەرسوڕهێنەر پێشکەشکرابوو. نەدەشیا ئەو سۆزانیانە رەتبکرێنەوە کەلەناو جوانترین پۆشاک و ئارایشت و خشڵدا رازابوونەوە، لەکاتێکدا هەمووشتێک لەپێناو باڵابوونی خۆی بەکاردەهێنا. گوندەکەمان وەک هەتیوێک بێکەس مابووەوە، تەنانەت ئاساییترین فەرمانبەری دەوڵەتیش خواوەندە نوێیەکەمان بوون. هەرگووتەو پۆشاکێکی خواوەندیبوونی تازەبوون. کاریگەرییەکان بەمجۆرە ئامادەکرا بوون. سەرباری ئەمەش نازناوی "کلکدار"لەکوردەکان نرابوو. ئیتر بۆئەوەی ساتێک زووتر لێی رزگار بین، فۆرمیلەکەیان بریتیبوو لەشارستانیبوون ـ بەدەوڵەتبوون ـ یەکسانە بەتورکبوون. تەنیا گوندو بنەماڵەی خۆمان بچووک نەدەبینی، ئیتر بەچاوێکی بچووک لەکوردایەتیشمان دەڕوانی. ئیتر ئەمانە وەکو کۆت و زنجیری پێمان دەبینرا. تەواوی دونیامان بەناو ئەم سێکوچکەدا تێپەڕدەبوو: چەندە ببیت بەشارستانی و پیاوی دەوڵەت و بە تورک، بەو ئەندازەیە دەبیتە پیاو. ئەمەبوو تیۆری کۆمەڵگای نوێمان. ئایین و عیرفانمان لەسەر ئەم بنەمایە واتادار دەبوو. سەرلەنوێ لەدەوروبەری ئەم سێینەیە بەکۆمەڵگابوونمان ئەنجامدەدا.**

**ئەو ئەنجامەی لێرە بەدەستمهێنا بەر لەبەنەتەوەبوون و جیابوونەوەی چینایەتی، شارستانیبوون و بەدەوڵەتبوون لەپێشەوە دێت، بەپێچەوانەی مەزەندەکان شارستانیبوون و بەدەوڵەتبوون وەک دوو فاکتەری سەرەکی بەکۆمەڵگابوون هەرزوو پێشوەخت دەستپێدەکات. پرۆلیتاربوون و سۆسیالیستی وەک بەرهەمێکی شارستانیبوون و بەدەوڵەتبوون، پێشوازی لێکردووین. وەکو سیفەتەکانی خوداوەندی دەوڵەتە. هێشتا لەبواری سۆسیۆلۆژییەوە ئەو کەسایەتییە شیتەڵنەکراوە کەلەناو دەوڵەت و شار پێکهاتووە. کەسایەتی کۆمەڵکاری و لادێ لەگەڵ کەسایەتی شاری و دەوڵەتگەرا دوو دیاردەی سۆسیۆلۆژین کەجیاوازی گەورەیان لەنێواندا هەیە. تاوەکو ئەم دیاردانە شینەکرێتەوە، شیکارکردنی چین، سۆسیالیزم و دیموکراسی زۆر بەناتەواوی دەمێنێتەوە. جیاوازی ناکۆکی ریشەیی لەنێوان کۆمەڵگای کۆمەڵکاری و لادێ لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایە هەیە کەشارو دەوڵەت مۆرکی خۆی لێداوە. ئەو کۆمەڵگایەی شارو دەوڵەت مۆرکی خۆی لێداوە چەندە دەوڵەتگەراو دەسترۆیە، ئەوا کۆمەڵگای لادێش هێندە کۆمەڵکار"یەکسانیخواز" و "دیموکرات" و"ئازاد"ە. لەم چوارچێوەیەدا گرنگترین ناکۆکی مێژوویی لەنێوان کۆمەڵگای شار ـ دەوڵەتگەراو کۆمەڵگای کۆمەڵکاری لادێدایە. تێکۆشانی بنەڕەتی لەنێوان دەسترۆیی شار ـ دەوڵەتگەراو دیموکراسی و کۆمەڵکاری لادێدایە. زۆر دواتر دەرکم بەم دیاردەیەکرد.**

**لەمەسەلەی "کەسیرە"شدا بەمشێوەیە بوو، لەراستیدا ژنەکە بەشێوەیەکی مەترسیدار هاواری دەکرد. تاوەکو گەردە بچکۆڵەکانی لاشەی سەرنجی رادەکێشاو دەیگووت "من خیانەتم لێم نزیک نەبیتەوە"منیش دەمگووت"نەخێر تاوەکو ئاشق دەبیت، لەگەڵ مندا دەبێت". ئیتر خۆشەویست و هەڤاڵان و دۆستانم بوونەتە یەک، کاتێک هەمان گۆرانی خیانەتیان دەچڕی؛ منیش دەمگووت "دەڵێن ئەی خۆشەویستم" ناچاربووم ئەمە بڵێم. لەکاتێکدا لەم چوارچێوەیەدا هەڵوێست و بۆچوونەکانی خۆم دیاردەکەم، بابەتەکانی ژیانی هاوچەرخ و هاوسەرێتی پێویستی بەهەڵوەستەیەکی زیاتر هەیە. ئەگەر مەسەلەکە لەسنوورێکی ئاسایی کۆمەڵایەتی،**

جەستەیی بمابایەوە باسم نەدەکرد. لەبواری کۆمەڵایەتی و کرداری ئەنجامی جددی لەخۆوە دەگرێ، وەکو کەسێتیش لەنزیکەوە من پەیوەندیدار دەکات.هەستم بەهەوایەکی وەهاکرد هەروەکو بڵێی سەبارەت بەبابەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ژن ئەوەی لەناو رەوشێکی ناتەواوو کەموکورتیدا دەبینرێ منم. ئەمە هەڵوێستێکی تادوارِدە جاهیلانەیەو مەترسی نەبینینی تێکۆشانە مەزنەکەمان لەخۆوەدەگرێت، بەشێوەیەکی بێواتا خۆی دەسەپێنێ. کاتێک دەستم بەنووسینی ئەم بەرگرینامەیەکرد، هەوڵمدا بۆ وەڵامدانەوەی هەموو جۆرە چەمکێکی ئەگەری دەرکەوتنیان هەیە، ئەو شەڕەی کۆمەڵایەتی "سۆسیالیستە" بێنمەوە یادم کە لەتەمەنی حەوت ساڵان بەدواوە دەستی پێکردووە. بەرامبەر بەیەکێک کەلەحەوت ساڵییەوە هێزی تێکۆشانی بەرامبەر مافی سۆسیالیتەی دایکی کردووە باسی "ژیانی سۆسیالیتەی هاوچەرخ "بکەی شەڕێکە بەرامبەر بەمن. بۆئەوەی زیاتر رۆشنکەرەوەبێت بەشێوەیەکی درێژ هەوڵمدا نموونەی کەسیرە روونبکەمەوە. تێنەگەیشتنی مەسەلەی من و ژن، "ئاپۆ و ژن" نەک تەنیا بۆ "PKK"، بەڵکو بۆ سەردەمەکەمان زیانێکە. یەکێکم لەوانەی کەلەم سەردەمەماندا گەورەترین شەڕی لەپێناو ژندا ئەنجامداوە. لەم بارەیەوە برِوایەکی زۆرم بەخۆم هەیە. باوەڕناکەم یەکێکی دیکە وەکو من هەبێ پەیوەندییە سەربازی، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی لەتەوەرەی ژندا شیکردبێتەوە. پێویستە ئاماژە بەوەبکەم کەیەکەمین ئەشقی جوامێرترین هاوڕێ کچ و کورەکانی خۆم بەربەستکرد، کۆسپم بۆنایەوە، لەم پێناوەشدا تەدبیری پراکتیکی و کرانەوەی تیۆری وەهام ئەنجامدا ئەقڵ پەی پێنابات. ئەو توانایەم هەبوو فۆرمیلەکەی دیاری بکەم.

لەبەرئەوەی لەبەشەکانی دیکەدا بەفراوانی باسمکرد، بۆ تەواوکردن ئاماژەی پێدەکەم. بەشێوەیەکی لێهاتووانە نیشانمدا کاتێک لەرەوشی بەرجەستەی رۆژهەڵاتی ناویندا شەڕی "ناموس"کە لەنەریتی دایکم و تەواوی گەلی کورد و گەلانی دیکەوە هاتووە، لەناوەڕۆکە قەباو زایەندییە هەرزانەکەی دەرخرا، چۆن لەناو کۆمەڵگا و سیاسەت و شەڕدا واتاداردەبێ. ئەنجام، ژن یەکەم چین و رەگەزو میللەتی چەوساوەو ستەملێکراوە. مسۆگەرە کەهەر تێکۆشانێکی دیموکراتی و سۆسیالیستی کەوەک میللەت و چین و رەگەز بەئازادی ژندا تێپەڕنەبێت بەئامانجی خۆی ناگات. لەکۆمەڵگای کوردستاندا هەر پەیوەندییەکی هاوسەرێتی و زایەندی و ئەشق کەلەبواری تیۆری و پراکتیکی پشتی بەپێشکەوتنێک نەبەستێت، کەلەسەر بنەمای ژن و یەکسانی بێت، هیچ بەهایەکی نابێت. هەرچەندە پێی نارەحەت دەبم، بەڵام دیسان دووبارەی دەکەمەوە لە"سۆزانێتی ماڵی تایبەت و گشتی" بەولاوە هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێ. ئەو بەڵێنەی بەرامبەر ژن دراوە، ئەو هەڤاڵێتییەی پەیرەودەکرێ، لای من واتایەکی قووڵی فەلسەفی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەیە، بۆ وڵاتپارێزی و ئازادی و یەکسانی هەوڵی پراکتیکی لەخۆوەدەگرێ. چەندە بەئێش و جێگای داخە کەهەست بەوە ناکرێ هێندەی تیۆری راستەقینەی ئەمە شەڕی مەزنیشم لەپێناودا بەرێوەبردووە.

تاوەکو مۆخی ئێسقان دەرکم بەو راستینەیە کردبوو کە راهیبە سۆمەریەکان عەشتاری ژنی ئەشق و خوداوەندیان بۆ پەرستگا گواستەوە، لەوێشەوە بۆ کۆشکی پادشا، کاتێک بردیانە لای پادشای ـ خوداوەند، لەگەڵ مردنی ئەم پادشایە بەزیندوویی لەگەڵیاندا زیندە بەچاڵ کران. تەنانەت ئەگەر پادشا ـ خوداوەندەکانیش بوونایە، هیچ کاتێک پەسندم نەدەکرد کە ژنان بکەن بە پارچەیەکی رازاندنەوەی مێزی رابواردن و کەیف و سەفا. بەڵام کاتێک تا رۆژگاری ئەمرۆمان زۆر وردەکارانە پارچە بە پارچە واتای خوداوەندی ژن و ئەشقیان خوارد، لەژێر ناوی هاوسەرێتی دوولایەنەی ژن ـ مێرد پێشکەش بە کۆیلەکانیان کرد، دەرکم بەوە کرد بەشێکی کەمیشیان بۆ پیاوە کۆیلەکان هێشتۆتەوە. چەندەی وەکو پیاوێک ئەم دیاریانەم پەسند نەکرد و باوەڕیم بەوە هێنا کە دەبم بە کوڕێکی باشی خوداوەندی دایک و ژنی ئەشق، ئەوا پڕ لەخۆشەویستی و شانازی دەبووم. بەمجۆرە بۆ یەکەمین جار لەقووڵایی مێژوو دەرکم بەخاکی دایک دەکرد، ئەو ناکۆکیانەم چارەسەر دەکرد کە بە هەزاران ساڵە گرێکوێرەی لێدراوە و دەمبینی کە لەدایکبوونی ئەمجارە جیاوازترە. باوەڕیم بەوە هێنابوو پەیامی ئەوە بەو دۆستانە بدەم کە تائێستا باوەڕییان بەمنە، ئەوانەی مردن دەسەپێنن و سەدەی بیستەم و تەواوی پیلانگێڕان، هەرکێیەک بن دەتوانم بەرەنگاریان ببمەوە. کاتێک شیمکردەوە و دەرکم بەوە کرد، منیان کردبوو بە بۆمبایەکی ئامادەکراو و ئەوەی دەیسەپێنن زۆر لە هێرۆشیما مەترسیدارترە، ئەڵقەکەیم راکێشاو تەواوی کەرەستەکانم بەرووی خولقێنەرانی بۆمباکە داداوە، ئاسوودە بووم. لایەنگری مرۆڤایەتی بووم، بۆ جارێکی دیکە خوداوەندەکانی زۆرداری ژێرکەوتبوون.

دەشێ بەرگرینامەکەم تەواوی مرۆڤایەتی فێرە شتێک بکات. دەشێ "PKK"ی کە سەرلەنوێ بونیادنراوەتەوە تەواوی هەڤاڵە رەسەنەکانم، ئەو هەڤاڵانەم کۆبکاتەوە کەخاوەنی هێزی واتا و ئیرادەن. کۆنگرەی گەل دەتوانێ تەواوی گەلی کوردستان و دۆستەکان لەژێر چەترێکی دیموکراتیدا کۆبکاتەوە. بەرامبەر ئەوانەی لەخۆیانەوە هێرشدەکەنە سەر ژیانمان، وڵات و کۆمەڵگاکەمان هێزی پاراستنی گەل HPG دەتوانێ شەڕێکی بەرگریکردن بەڕێوەببات؛ دەشێ حیساب لەبێ مێشک، ستەمکارو زۆردارەکان بپرسێ. رەسەنترین ژنەکانمان دەتوانن لەژێر چەتری PAJK کۆببنەوە کەلەژێر پێگەیشتوویی هەمیشەیی خوداوەندەژنەکان و بێگەردی فریشتەو جوانی ئافرۆدیت ئاوێتەی کردوون.

### ٤. هاوژیانی ئازاد لە نەتەوەی دیموکراتدا.

بەرلەهەموو شتێک پێناسەکردنی ژن و دەستنیشانکردنی رۆڵەکەی لەژیانی کۆمەڵگادا بۆ ژیانی راست مەرجە. بەهۆی تایبەتمەندییە بایۆلۆژی و ستاتۆ کۆمەڵایەتیەکەی ژنەوە ئاماژە بەو داوەرییە ناکەین. وەک کەینونە و بوونێک دەستەواژەی ژن گرنگە. بەو رادەیەی ژن پێناسە بکرێت ئەگەری پێناسەکردنی پیاویش هەیە. لەمیانەی دەست پێکردن بە پیاوەوە ناتوانین پێناسەیەکی راست بۆ ژن و ژیان بکەین. بوونی سروشتی ژن لە پێگەیەکی ناوەندی تر دایە. لە بواری بایۆلۆژیشەوە دۆخەکە بەم جۆرەیە. بچوککردنەوەی ستاتۆو بێ کاریگەرکردنی ژن لەلایەن کۆمەڵگای پیاوسالارییەوە پێویستە تێگەیشتنی راستی ژنمان لێ بەربەست نەکات. سروشتی ژیان زیاتر پەیوەندی بە ژنەوە هەیە. پەراوێزخستن و بەدەرنانی ژن لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو راستیە ناگۆڕێت، بە پێچەوانەوە دەیسەلمێنێت. پیاو بەهێزە لەناوبەرو زۆردارەکەیەوە لەراستیدا لە کەسایەتی ژندا هێرش دەکاتە سەر ژیانەوە. بەو سیفەتەی باڵادەستی کۆمەڵگایە دوژمنایەتی پیاو بۆ ژیان و وێرانکردنی لەنزیکەوە پابەندی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیەیە کەتێیدا دەژیت.

کاتێک ئەو داوەریەمان دەکەین بەگەردوونی دەشێت دوالیزمی وزە - مادده بەبنەما بگرین. بە بەراوارد لەگەڵ مادده وزە سەرەکیترە. خودی ماددەش وزەی بەبونیاد بووە. ماددەش شێوەی شاردنەوەی وزە و بوونەکەیەتی کە بووە بە فۆرم. بەو تایبەتمەندێتیەوە مادده وزە دەخاتە قەفەزەوە و لێشاو و جولەکەی دەوەستێنێت. پشکی وزەی هەر فۆرمێکی مادده لێک جیاوازە. هەڵبەتە ئەو جیاوازیەی وزەش جیاوازی نێوان فۆرم و بونیادە ماددییەکان دەست نیشان دەکات. وزەی ماددەو فۆرمی ژن لەگەڵ وزەی ماددەی پیاو جیاوازە. ئەو وزەیەی ژن هەڵیگرتووە هەم زیاترە هەم چۆنیەتی وزەکە جیاوازترە. فۆرمی ژن سەرچاوەی ئافراندنی ئەو جیاوازیەیە. کاتێک لەسروشتی کۆمەڵگا وزەی پیاو بۆ ئامێرەکانی دەسەلات دەگۆڕێت دۆخی شێوەو فۆرمی ماددی بەدەست دێنێت. بەو سیفەتەی وزەی ساردەوەبووە شێوەکانی لەتەواوی گەردوون محافەزەکارن. بوون بە پیاوی زاڵ یان باڵادەست لەکۆمەڵگادا گەیشتنە بەدۆخی شێوەگرتنی دەسەلات. بەو حاڵەتەشیەوە ئەو وزەیەی هەڵیگرتووە زیاتر فۆرمی بەدەستهێناوە. ئەو وزەیەی بۆ فۆرم نەگۆڕاوە کەمەو لە کەسانێکی زۆر دەگمەندا روودەدات. هەرچی لە ژندایە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا وزە نابێتە فۆرم و ناکەوێتە ناو بچمێکەوە. وزە دۆخی لێشاوو بزێوی خۆی دەپارێزێت لە ژندا. ئەگەر نەخرێتە ناو فۆرم و هزری پیاوو تێیدا بەند نەکرێت ئەوا بەسیفەتی وزەی ژیان بەردەوامی بەلێشاوو بزێوی خۆی دەدات. ئەو جوانی و بەهرە شیعریی و رۆحیەی (پۆتانسێلی مانا) ژن کەنەبووە بە بەستەڵەک لە نزیکەوە گرێدراوی ئەو دۆخەی وزەیە. بۆ تێگەشتینی ئەو راستیە پێویستە لەقوڵاییەوە دەرک بە ژیانی زیندوو بکرێت.

کاتێک لەمیانەی ئەو دیدگا فەلسەفیەوە روو لەراستی ژن بکەین، بەو ئەنجامە دەگەین کە پێویستە رایەڵەی ژیانی مانادار لەگەڵ لایەنە چاک، راست و جوانەکانی ژندا ببەستین. کاتێک لە میانەی ئەو داوەریەوە تەماشەی مەسەلەکە بکەین ئەوا ناشێت ئامانجی بنەڕەتی ژیان لەگەڵ ژندا زاوزێ و زۆربوون بێت. لەوانەیە بڵێن کە سادەترین زیندەوەرە تاکخانەکانیش ئاکاداری زۆربوونن و لەوانەیە تاکە ئامانجی ژیانیشیان لەسەر ئەو بنەمایە کۆد کرابێت. بەڵام ئەو پەرەسەندنەی گەشەی کردووە

پیشانمان دەدات کە خۆ دابەشکردنی تاکخانە بۆ دووبەشی یەکسان کۆتایی ژیان نییە، بەڵکو ئەو چالاکیەی تاکخانە کە بەملیۆنان جار دابەش بووە لەجیاتی کۆتایی هێنان بە ژیان بەڵکو بەخێرایی بەرەو هەمەڕەنگی و جیاوازی بردووە، هەربۆیەش وەڵامە مانادارەکەی دواتر زۆر بوون نییە بەڵکو گۆڕانکاری و وەرچەرخانە. زۆربوون ئامرازێکی پێویستی ژیانە، بەڵام بۆ تێگەشتنی هەرگیز بەش ناکات. زۆربوون ئامرازە، ئامانج یاخود مانایی نییە. بەمانایەکی تر ژیانێک تاکە مانای زۆربوون بێت ژیانێکی زۆر ناتەواو بەکەموکورییە. کاتێک لەزیندەوەرێکی تاک خانەدا رەوش بەم جۆرەبێت، ئەوا ژیانی مرۆییانە لەگەڵ ژندا تەنیا بەستنەوەی بەزۆربوونی زایەندی و زیادبوون تەنیا ناتەواوی مانای ژیان نییە، بەڵکو گوزارشت لە کوێربوونی ژیان دەکات. هەڵبەتە بەگوێرەی ئەوەی زۆربوون لای ژن بەشێوەی ئەمیبیا روونادات، کاتێک لە ژیانی هاوبەش لەگەڵ ژن زاوزێ دەکرێت بە ناوەند و ئامانجی ژیان واتە مانای پێویست لەپەرەسەندنە شکۆدارەکەی زیندەوەران بەدەست نەهێنراوە. کەچی لەرێگا تەکنۆلۆژیای رۆژی ئەمرۆمان گرفتی ژمارەی دانیشتوان لەکۆمەڵگای مرۆڤدا بەتەوای دەربازکراوە. کەمی ژمارەی جۆری مرۆڤ نەبۆتە کێشە، بەپێچەوانەوە ئەو زۆربوونەی کە ئیتر لەسەر رووی دونیا جێگای نابێتەوە چەندەی دەچێت دەبێت بەکێشەیەکی گەورە. هەروەکو لە زیندەوەری تاکخانەشدا سەلمێنرا زۆربوون وەک پێویستیەکی خێراییەکەیو گرێدانی بەئاستە بەراییەکەی، هەر زۆربوونێک مانای مردنە. لەتەواوی جۆرەکانی پەرەسەندن زۆربوونی جەستەیی مانایەکی بەم جۆرەش لەخۆوە دەگرێت. ئەو بوونەوەرەی کۆتاییەکەی مردنە لەو بروایەدایە لە رێگای زۆربوونەوە دەتوانێت خۆی بۆ هەمیشە بژێنێت، بەڵام ئەمە بەهەڵەداچوونە. درێژەدان بەخود لەرێگای کۆپیەکەیەوە لەوانەیە پێویستی ئاسایش و ئارەزووی تەقلی بوون بەئەبەدیەت دڵنیا بکات، بەڵام نایکات بەواقیعی و راستەقینە.

بە کورتی فەلسەفەیەکی ژیان کە پشت بەزاوزێ لەگەڵ ژندا دەبەستێت مانایەکی جدی نییە. لە کۆمەڵگای چینایەتی دیاردەکانی لەجۆری میرات و بەهێزبوون مانای لەژن بارکردووە. ئەمەش مانایەکی پەیوەست بەچەوسانەوەو سەرکوتکردنەو بۆ ژنیش نەرێنییە. واتە ئەو ژنەی زاوزێی زیاتر دەکات، زووتر دەمرێت. ژیانێک کە بەهای مانای لەگەڵ ژندا زۆر بەرزبێت: یان وەچەخستنەوەیەکی زۆرکەم، یانیش ئەگەر کێشەیەکی لەچەشنی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی جۆری مرۆڤ لەئارادا نەبێت لەگەڵ ئەو ژنە بەدیدێت کە هیچ زاوزێ نەکات. خستنەوەی وەچەی زۆر بۆ ئەو گەلە کۆلۆنی و دواکەوتوانەی وەک تاکو کۆمەڵگا خۆیان بەهێزی سیاسی و رۆشنبیری پێشنەختستووە دەشێت وەک بەرگری خۆیی بەهایەکی هەبێت. وەڵامدانەوەی قڕکردن لەرێگەی زۆرکردنی بنەچەوە رێبازێکی بەرخودان و هێشتنەوەی بوونی خودە. بەڵام ئەوە بەرگری خۆیی ئەو کۆمەڵگایانەیە کە هێندە دەرفەتو شانسی ژیانی ئازادیان نییە. هەربۆیەش لەو کۆمەڵگایانەی ئاستی مانایان تا ئەو رادەیە نزمە ژیانێک لەگەڵ ژن بەدینایەت کە ئاستەتیک و راستی بەبنەما گرتبێت. راستی ئێستای کۆمەڵگاکانی جیهان ئەوە دەسەلمێنن. لە رۆڵی خۆراک دان و پاراستنی ژیان لەگەڵ ژندا لایەنێکی تایبەت و سەربەخۆی نییە. خۆراک و پاراستن بۆ هەر زیندەوەرێک پێویستەو لەجێگای خۆیدایە. گفتوگۆکردن سەبارەت بە ژیانێکی بێ ئافرەت یاخود بێ پیاو مانایەکی ئەوتۆی نییە. لەسەرجەم ژیانی توخم یا ناتوخمەکاندا دیاردەی نێرینە - مێینە جێگای باسە. لەو سۆنگەیەوە کێشە لەگەڵ خودی هاوژیانی نییە، پەیوەندی بەو مانایەیەتی کە لەکۆمەڵگای مرۆڤدا هەیە.

کۆمەڵگای مرۆڤ شێوەی ژیانی هەر جۆرێکی زیندوو نییە. تایبەتمەندێتی ئاواکردنی دیاردەی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی ناوخۆییو سەر سروشت لەخۆوە دەگرێت. هەر وەک لەدەسەڵاتی دەوڵەت - نەتەوەدا دەبینرێت لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتی راکردن بەدوای زۆرترین یان بەرزترین نەتەوە لەوانەیە هەسارەی ژیان بکات بەگۆڕستانی ژیان. ئەو شێواندن و لادانەی ئێرە سەرچاوەی خۆی لەکۆمەڵگای پیاوسالاری وەردەگرێت. ئەو هەژموونگەراییەی باڵادەستی پیاو لەسەر ژیانی ژنی ئاواکردووە هەسارەکەمان بەدۆخێک دەگەیەنێت دەرفەتی ژیانی تێدا نەمێنێت. لە رێگای پەرسەندنی بایۆلۆژییەوە بەو ئەنجامە ناگات، بەڵکو لەمیانەی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی پیاوسالارییەوە پێی دەگات. هەر بۆیەش پێویستە بەیەکەوە ژیان لەگەڵ ژندا لەدیاردەی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی پیاوسالاری رزگاری بێت. وێڕای ئەوەی ژیانی کەوتۆتە ژێر حکومڕانیەوەو بە ملیۆنان ساڵ لەمیانەی خەسڵەتی وەچەخستنەوە مرۆڤایەتی ژیاندووە، لەرێگای مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە ئەو وەچەخستنەوە بەشێوەیەکی ئیرۆنیک کۆتایی

**بەژیان دێنێت. ژیان لەگەڵ ئەو ژنەی لەژێر ستاتۆی ئێستا دایە هەواڵی کۆتایی ژیان دەدات. هێما ناکۆتاکانی ئەو راستییە لەئارادیە. ئەگەر ریزیان بکەین:**

**آ. ژمارەی دانیشتوان بەئاستێک گەیشتووە چیتر لەهەسارەکەمان جێگای نابێتەوەو جۆرەکانی دیکەی زیندەوەرانیشی خستۆتە ژێر هەرەشەوە. ئەو شێوازەی ژیان لەگەڵ ئەو ژنەی لە ژێر ستاتۆی ئێستادایە بەخێراییەکی بەردەوام لەزیادبوون دایە ئیکۆلۆژیاو سروشتیبوونی ژیانی خستۆتە ژێر هەرەشەوە.**

**ب. هەروەها ئەو ژیانە لەناوەوەو دەرەوەی کۆمەڵگاکان رێگا لەپێش توندوتیژی بێ سنووری دەسەڵات دەکاتەوە. ئەو ئاستەی میلیتاریزم پێی گەیشتووە بەشێوەیەکی تێروتەسەل ئەو راستیە دەسەلمێنێت.**

**ج. لایەنی زایەندی (سێکسی) ژن کراوە بە ئامرازێکی مەترسیداری بەکارهێنان، چەوسانەوەو سەرکوتکردنێکی سامناکی لەسەر ئاواکرداوە. ژیان بەتەواوی دووچاری لادان کراوە، تەنانەت لەگەڵ گومرابون و لادانێکی زایەندی هاوتا کراوە کە زۆر بێ مانایانە دووبارە دەبێتەوە.**

**د. ئەو ژنەی هەنگاو بەهەنگاو دەسرێتەوە، بەشێوەیەکی زۆرەملێیانە دەکرێتە ئامرازێکی بەردەوام کردنی وەچە، کاڵای سێکسی و هەرزانترتین هێزی کار. وەک بڵێی هیچ مانایەکی دیکەی نییە.**

**ه. جۆرێک لەجینۆسایدی کولتووری لەسەر ژن بەرێوەدەبرێت. بەڵام بەهۆی لایەنی زایەندی و رۆڵی بەردەوامکردنی وەچە وەک سوپای بێکارە کەم کرێکان یان بێ کری بەهایان پێدەدرێت. لەو هێزە خۆییە بێبەشکراوە کە لەبواری جەستەییو ئەخلاقی و مانابییەوە بتوانێت بەرگری لەخۆی بکات.**

**و. کۆمەڵگایەک لەژێر ئەو فاکتەرانەوە ژن بخاتە ناو مەنگەنەی ژیانێکی بێ واتا تەنیا دەشێت کۆمەڵگایەکی نەخۆش بێت. کۆمەڵگایەکی ژنی بێماناش، بێواتا دەبێت.**

**ئەو هێمایانەی دەتوانین زیاتریان ریزبکەین بەشێوەیەکی روون پێویستی خێرای وەرچەرخانی ریشەیی هاوژیانی لەگەڵ ژندا دەخاتە روو. ژیانی ئازاد لەگەڵ ئەو ژنەدا محاڵە کە بێ بەرگرییە و موڵکە. لەبواری ئەخلاقیشدا ئەستەمەو نابێت. چونکە تەنیا لە حاڵەتی لەناوبردنی ئەخلاق کۆیلایەتی بەدی دێت. هەڵبەتە ئەخلاقی هێزە هەژموونگەراکان بەئەخلاق ناو نابەین. هێزی هەژموونگەرا، لەو نێوەندەدا پیاوێتی زاڵیش تەنیا دوای داڕووخانی ئەخلاقی کۆمەڵگا بەدی دێت. بەگوێرەی ئەوەی ژیان بەبێ ژن نابێت ( پێچەوانەکەشی لەجێگای خۆیدایە؛ پیاو نەبێت ژیان دەبێت بەڵام ژیانێکی کۆیلایەتی دەبێت)، رزگارکردنی ژیان رزگارکردنی ژن دەکات بەناچارییەک. ئەو باسەش زیاتر سەبارەت بەو ژنەیە کە لەناو بونیادی کۆمەڵگادایە. دونیای زهنیەت و پەیوەندیەکەی گرنگی کێشەی ژنی ناواخنی بایەخدارتر دەکات. تا زهنیەتێک پەرەی پێنەدرێت کە بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە بەرەنگاری هێما نەرێنیەکانی دەرهەق بەژن ببێتەوە، ئەوا بەگشتی بەشێوەی هاوسەر، بەتایبەتیش ژیان بەشێوەی هاوژینی ژیانی ئازاد محاڵە. لەو سۆنگەیەوە ئەو پێویستیانەی وەک تێزی بەرامبەر بۆ ژیانێکی هاوژینی ئازاد لەگەڵ ژندا پێویستن بەو شێوەیە کورت دەکرێتەوە:**

**آ. بەرلەهەموو شتێک پێوستی بەدەستەواژەیەکی هاوژینی ئیکۆلۆژی هەیە کە بەردەوامکردنی رەچەڵەک و زۆربوون بەبنەما ناگرێت، بەگوێرەی بیرو خەیاڵی مرۆڤایەتی گەردوونییەو ژیان و هەبوونی زیندەوەرەکانی دیکەی هەسارەکەمان رەچاو دەکات. ئەو ئاستە گەردوونییەی کۆمەڵگا پێی گەیشتووە ژیانی ئازاد لەگەڵ ژیندا دەکات بە ناچارییەک. تەنیا لەسەر بنەمای ژیانیکی ئازاد لەگەڵ ژندا دەشێت سۆسیالیزمی راستەقینە ئاوابکرێت. ئەولەویەتی سۆسیالیزم مسۆگەر پێویستی بەجێگرکردن و گەیشتن بەئاستی ژیانی ئازاد لەگەڵ ژندا هەیە.**

**ب. لەو پێناوەشدا پێویستە تێکۆشانێکی زهنی و دامەزراوەیی لەبەرامبەر دەسەڵاتی هەژموونگەرایی پیاوسالاری بکرێت و لەئاستی هاوژینی ئازاددا سەرکەوتنی ئەو تێکۆشانە لە ئاستی زهنیی و دامەزراوەیی مسۆگەر بێت. ئەو سەرکەوتنە بەدەست نەهێنرێت هاوژینی ئازاد بەرجەستە نابێت.**

ج. پێویستە هەرگیز ژیان لەگەڵ ژن بەمانای هەمیشەیی کردنی ئارەزووی سێکسی و زۆر ئەنجامدانی شیرۆڤە نەکرێت. ژیانی کۆمەڵگای رەگەزگەرایی (ڕەگەزپەرستی) کە لە رێگای شارستانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە بەئاستی زۆر ترسناک گەیەنراوە لەسەرجەم بوارە هزری و دامەزراوەییەکان لەناونەبرێت و پاکنەکرێتەوە هاوژینی ئازاد ئاواناکرێت. لەو دونیابینی و دامەزراوانەی ژن وەک دیاردەیەکی موڵکایەتی و ئۆبژەیەکی زایەندی دەبینرێت ژیان لەگەڵ ژن تەنیا بێ ئەخلاقیەکی گەورە نییە، لەهەمان کاتدا چەپەڵترین و چەوتترین شێوەی ژیانە. لەژێر ئەو هەلومەرجەدا نموونەی دیاردەیەکی دیکەی کۆمەڵایەتی لەئارادا نییە کە لەو سۆنگەیەوە پیاوێک ژنێک هێندە بپوکێنێتەوە و بچووکی بکاتەوە.

د. تەنیا لەو هەلومەرجانەدا هاوژیانی ئازاد لەگەڵ ژندا بەدی دێت کاتێک موڵکایەتی یان بە موڵکردنی ژن رەت بکرێتەوە، رەگەزپەرستی کۆمەڵایەتی بەکارهێنراو بەتەواوی دەربازبکرێت و لە هەموو ئاستێکدا یەکسانی (لەسەر بنەمای جیاوازییەکان)بەرقەرار بکرێت.

ه. هاوژیانی ئازاد تەنیا لەگەڵ ئەو ژنە بەدیدێت کە لەدۆخی ئامرازی بەردەوامکردنی بنەچە و بێ کاری و کارکەری هەرزان یاخود بێ کرێ رزگاری ببێت و لەجیاتی ئۆبژەبوون لەهەرئاستێکدا ببێت بەسۆبژە.

ر. تەنیا لەژێر ئەو هەلومەرجە ئەرێنیانە دەشێت کۆمەڵگا لەگەڵ هاوژیانی ئازاد بگونجێت، لەو سۆنگەیەوە بۆ کۆمەڵگایەکی هەلومەرجی یەکسان و ئازاد بگۆرێت.

و. ئەو ژن و پیاوانەی لەژێر هەلومەرجی ئەرێنی کۆمەڵگا پەرەیان بە بەهای مانایی و بونیادی خۆیان داوە دەشێت خاوەنی هاوژیانی ئازادبن.

پێویستە زۆرچاک بزانین کە گەشەکردنی شارستانی هەژموونگەرا و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری باجەکەی نکوڵیکرن بوو لە هاوژیانی ئازاد. لەبەرئەوەی دەرفەتی هاوسەنگی هێزی مانایی و بونیادی نێوان ژن و پیاو لەبەین براوە کە مەرجی ژیانی عەشقی کۆمەڵایەتییە عەشق روونادات یان جێگای باس نییە. عەشق لەهەلومەرجەکانی هاوسەرگیری بەدینایەت کە وزەی مانای لەدەستداوە و لەناکاو لەمیانەی پەیوەندییە کۆیلایەتیەکانی کۆمەڵگای کۆیلە ئافرێنراوە. لەبەر ئەو هۆکارەش کاتێک دەرفەتی هاوژیانی ئازاد نامێنێت کاریگەری کوشندەی دەسەڵاتی مۆدێرن و هەژموونگەرا دەبینرێت. هەربۆیەش ئەو ژیانەی وەک پەرچووێکی تەلیسماوی لەلایەن مرۆڤایەتیەوە پێشوازی لێکراوە بەهای تەلیسماوی خۆی لەدەست داوە، بووە بە کارەساتێک کە بەخەم و خۆکوشتنەوە لەلایەن ژنەوە پێشوازی لێدەکرێت. پێویستە چاک بزانرێت کە هاوسەرێتی بونیادنانێکی کۆمەڵایەتییە. ئەو ژیانە لەنێوان کەسە نێرو مێیەکان بەدی نایەت؛ بەڵکو لەلایەن ژنێتی و پیاوێتی دروستکراوەوە پێکدەهێنرێت. زۆر چاک ئاگادارین کە ئەو بونیادنانە هەژموونگەراییە هەردوو رەگەز (ژن و پیاو) سەقەت دەکات، پەیوەندییەکەی نێوانیشیان بەممەوە کاریگەر دەبێت و بەشێوەی پەیوەندی هەژموونگەرایی رەنگدەداتەوە. لە پەیوەندی هەژموونگەرایشدا عەشق جێگای باس نابێت. مەرجی سەرەکی عەشقی مرۆڤ ئیرادەی ئازادی هاوسەنگی لایەنەکانە.

کاتێک شارستانی و مۆدێرنیتە لەمیانەی ژیان و هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی و دامەزراوەیی پەیرەو دەکرێت، بەدرێژایی مێژوو بەناوی عەشقەوە لەناو دووفاقیدا دەمێنێتەوە. زۆرباسی عەشق دەکرێت بەڵام ئەنجام نادرێت. بەجۆرێک لەجۆرەکان ئەدەبیاتی دونیا برتییە لەباسی عەشقە بێ ئاکامەکان. ئەو داستانانەی لەباسەکانیان ژن بەهۆکاری هەڵگیرسانی شەڕەکانیش دادەنێن بەڵگاندنی ئەو راستیەیە. تەواوی شێوەکانی هونەر وەک دان پێدانانی عەشقی بێ ئاکامە تەنانەت ئایینەکانیش بەجۆرێک لەجۆرەکان کۆنترین شاکارەکانی هونەرن کە بەشێوەیەکی بەهێز لەخواست و ئارەزووە یەکلایەن یان بێ ئاکامەکانی پەیوەندی نێوان نێر خوداوەند- مێخوداوەند کاریگەر بوون. پیرۆزکردنی هاوژیانی بەشێوەی "ژیانی تایبەت" لەلایەن سیستەمەکانی شارستانیەوە سەراوبنکراوترین داوەری حەقیقەتی کۆمەڵگایە. لەڕاستیدا تێگەیشتنی گشتی وەک تایبەت، تایبەتیش وەک گشتی لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگا گونجاوترە. پەیوەندییەکەی هاوژیانی خاوەن کۆمەڵێک تایبەتمەندییە کە لەڕیشەوە کاریگەری لەسەر گەردوونی بوونو سەرجەم رایەڵە کۆمەڵایەتیەکان دەکات. گەورەترین دووڕوویی شارستانی لەوەدایە، ئەو پەیوەندییە گەردوونییە بەتاکە دیاردەیەکی دووانەیی زۆر مەحرەم لەقەڵەم دەدات. ئەمەش یەکێکە لەسەرەکیترین هۆکارەکانی بێ کەڵکی و بێ بایەخی زانیاری سۆسیۆلۆژیا. گوتەی "ژن یان مرۆڤ دەکات بە فەیلەسوف یان شێتی دەکات" کە گوایە تایبەت بە سوقراتە، لەگەڵ ئەو

پەندەی دەڵێت: "ژن دەتکات بە وەزیرو دەتکات بە رەزیلیش" دیسان پەیوەندی بەبواری گشتی راستەقینەوە هەیە. چونکە جیاکردنەوەی بواری "تایبەت"و "گشتی" لەناو کۆمەڵگادا چەواشەکارییەکی مۆدێرنیتەیە. لەکۆمەڵگای راستەقینە و رەسەندا جیاوازییەکی بەم چەشنە هیچ مانایەکی نییە. راستیەکەی، ئەمانە شێوەی سەرەکی و دیاریکەری پەیوەندین.

یەکەم هەنگاوی بەناوی ژیانەوە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤی بهاوێژین پێویستە سەبارەت بە هاوژیان بێت. هیچ بوار یان کایەکی ژیان هێندەی بواری هاوژینی خەسڵەتی دیاریکەر و بنەڕەتی بوونی نییە. دانانی ئابووری و دەوڵەت بەپەیوەندی سەرەکی چەواشەکارییەکی سۆسیۆلۆژیایە. لەدەرئەنجامدا ئابووری و دەوڵەتیش هەردووکیان ئامرازی هاوژیانین. ناشێت و نابێت هاوژیانی لەخزمەتی ئابووری، دەوڵەت و ئاییندا بێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە دەوڵەت، ئایین و ئابووری ناچارن لەخزمەتی هاوژیانی دابن. هەربۆیەش ئەو سەراوبنبوونە تەواوی سۆسیۆلۆژیای مۆدێرنیتەی گرتۆتەوە.

وەک پێویستیەکی تەواوی ئەو باسە یەکەمین بواری پێویستی بە بونیادی زانستی هەیە پێویستە بواری هاوژیانی بێت. میتۆلۆژییەکانی چاخی کۆن کە زۆر سەرەتایی دەبینرێن و لەخۆڕاییە کە بەردەوام ئایینەکان بەم بوارەوە دەستیان پێکردووە، لەراستیدا پەیوەندییان بەحەقیقەتی کۆمەڵگاوە هەیە. هاوژیانی یەکەمین هەنگاوە کە بەتایبەتی لەتەوەری ژنەوە بەرەو زانست و سۆسیۆلۆژیای راست دەنرێت. نەک تەنیا لەبواری سۆسیۆلۆژیا بەڵکو لەبوارەکانی هونەرو فەلسەفەشدا پێویستە یەکەم هەنگاو لەدەوری ئەو پەیوەندییە بهاوژرێت. هیچ پێویست ناکات بڵێین بەو سیفەتەی لقێکی فەلسەفەن پێویستە ئەولەویەتی ئەخلاق و ئایینش لەوبوارە بێت. ئایین و ئەخلاق بەڕادەی پێویست خۆیان بەو بوارە بەستۆتەوە.

مایەپووچبوونی هێزەکانی چەوسانەوەو دەسەڵاتی هەژموونگەرایی سەردەمەکەمان زیاتر لەداروخانەکەی هاوژیانی دا دەکەوێتە روو. مێژوویی پەیوەندی نێوان ژن - پیاو مانای خۆی لەدەست داوە، بەدۆخێکی لەناوچوون گەیشتووە کە نە لەگەڵیدا و نە بەبێ ئەو هیچ دۆخێکیان نابێت. ئەوانەی شۆڕشی سەرەتایان لەسەر بنەمای شیکارکردنی ئەو رەوشە کائۆسییە پەرە پێنادەن جگە لەدرێژەدان بە کائۆس هیچ دەرفەت و چانسێکی دیکەیان نییە. ئەوانەی پێهەڵگرتنی شەخسی و جڤاتی ئەنجام دەدەن، تەنیا کاتێک لەلایەنەکانی زانستی، هونەری و فەلسەفیەوە ئەو بوارە بەبنەما بگرن، دەتوانن هەنگاو بەرەو هاوژیانی ئازاد بهاوێژن. وەک مەزەندە دەکرێت یەکەمین هەنگاوی ئەو پێهەڵگرتنە هەنگاوێکی تایبەت و تاکانەی نێوان دوو کەس نییە، بەڵکو یەکەمین هەنگاوە کەسەبارەت بەپەرەپێدانی کۆمەڵگای سۆسیالیستی دیموکراتیک دەنرێت.

بەر لەهەموو شتێک پێویستە سۆسیالیستبوون پەیوەستی جێگیرکردنی ئاستی ئازادی هاوژیانی بێت. پێویستە شێوازی ژیانێکی مەزنی پرەنسیپی و دژواری کرداری بەبنەما بگیرێت کەلەسەرەتای ژیانی میتۆلۆژی کۆن و ئایینی دەبینرێت. تەنیا لەمیانەی دەربازکردنی شێوە و ناوەڕۆکی ماڵیکەری مۆدێرنیتەی سەرمایەداریو سیستەمەکانی شارستانیەوە بونیادی سۆسیالیستیانەی هاوژیانی جێگای باس دەبێت. ئەو رەچەڵەک گەرێتی (بەمانای زۆربوون)، گەمەکانی ماڵیکردن و زایەندگەرێتیەی سیستەم گشتاندوویەتی پەیوەندییەکی بە "هاوسەرێتی سەر یەک سەرین" ەوە نییە. بەتایبەتیش پەیوەندی بە جووتبوونی زایەندی رۆژانەییەوە نییە کە لەدۆخی ئێستاماندا تەواو کراوە بەنەخۆشیەک. نەبوونی جووتبوونی زایەندی رۆژانە لەهیچ گیانلەبەرێکدا، بەپێچەوانەوە پەیرەوکردنی بەشێوەیەکی خولی دەیسەلمێنێت کە زایەند لەجۆری مرۆڤ بەشێوازی کۆمەڵگا بونیادنراوە. برسێتی زایەندیو زێدەڕۆیی کردن پابەندی بونیادی کۆمەڵگاو دەسەڵاتی هەژموونگەراییە. ئەو رەگەزپەرستیەی لەلایەن پیاووە بەسەر ژندا دەسەپێنرێت، بەهەموو شێوەکانیەوە خۆی وەک بەرجەستەکردنی دەسەڵات دەخاتە روو. ئەمجۆرە رەگەزپەرستیە نەک هەر تەنیا بەختەوەری پێ نابەخشێت، بەڵکو بەتەواوی سەرچاوەی نەخۆشی و بێهیواییە، لەناوچوون و مردنی پێشوەختە. بونیادی هیچ پیاو یان ژنێک ئەو پێکهاتەیەی نییە لەگەڵ ئەو شێوازەی زایەندگەرێتی بگونجێت. بەتایبەتیش ئەو زایەندگەرێتیەی سەرمایەداری لەمیانەی ریکلامچێتی ژنەوە دەیوروژێنێت بەتەواوی پەیوەندی بە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییەوەیە، لەپێناو بەدیهێنانی یاسای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجە. دەتوانین بڵێین کە هیچ پەیوەندییەک هێندەی رەگەزپەرستی کۆمەڵایەتی

**هێزو توانای هەڵگرتنی سیستەمی نییە. لەو سۆنگەیەوە ئانتی- سەرمایەداری تەنیا لەرێگای رەتکردنەوەی ئەو ژیانەی شێوازی رەگەزپەرستی و دەربازکردنیەوە بەدی دێت.**

**ئەو ئاستەی لەپەیوەندییەکانی هاوژیانی پەرەی پێدەدرێت چەندە زانستی، هونەری و فەلسەفی بێت، بەو رادەیە دەشێت رێگا لەپێش کۆمەڵگای سۆسیالستی بکاتەوە. بەر لەهەموو شتێک ئاواکردن و پەیڕەوکردنی سۆسیالیزم لەپەیوەندییەکانی هاوژیانیدا بەهایەکی کرداری و پرەنسیپیانەی دەست لێبەرنەدراو و ژیانی هەیە. لەدەرەوەی ئەو شێوازەی پەیوەندی رێگایەکی دیکە نییە بەرەو سۆسیالیزمت ببات. ئەگەر هەش بێت، ئەو پەیوەندیانە ناڕاستەوخۆنو بۆ هەڵە کراوەن. نرخاندن و تێگەیشتنی هاوژیانی سۆسیالیستانە وەک پەیوەندی نێوان دووکەس هەڵوێستێکی ناتەواوە. بێگومان دەشێت هاوژینی بەرجەستەکردنی دووانەیی بەخۆوە ببینێت، بەڵام ناشێت بۆ ئەو دۆخە بچووک بکرێتەوە. هاوژیانی هێزی گەورەی مانا، ئەستاتیک و جوانییە، بەشێوەیەکی دەرهەستیش ژیانێکی گەوهەرییە.**

**ژن و پیاوەکانی پەیوەست بە ژیانی سۆسیالیستانە کاتێک ژیانی ئازاد لەبواری گەردوونی و هاوبەش بەرجەستە دەکەن، ئەوا وەک تاکیش دەشێت دەرفەتی ژیانێکی راستو جوان بەدەست بێنن. لەسەرجەم بزاوتە گەورەکانی کۆمەڵگادا دەشێت ئەو راستیە ببینرێت. تێکەڵ نەکردنی ژیانی تاک (کەسی) لەگەڵ گەمەکانی هاوسەرگیرێتی ئێستا و شێوە خراپترەکەی دەرەوەی هاوسەرگیری گرنگو بایەخدارە. وێڕای ئەوەی لە ژیانی تاکانەیی (کەسی) دا تەواوی پۆتانسێلی گەردوونی بوونو هاوبەشێتی شاراوەیە، بەڵام بەشێوەکانی دەرەوەی هاوسەرێتی و ماڵیکردنی تاکانەیی شارستانی و مۆدێرنیتە نکوڵکردن لەگەردوونی بوونو هاوبەشێتی جێگای باسە. ئەو جیاوازییە نەکرێت ژیانی ئازادانەی پاژەی سۆسیالستانە بەدی نایەت. ئەو پیاوەی، بەتایبەتیش ئەو ژنەی دەکەوێتە ناو چوارچێوەی پەیوەندی سۆسیالیستیەوە لەمیانەی ئەو فەلسەفیبوون، ئەخلاقی، جوانی و زانستیبوونەی لەخۆیدا بەرجەستەی دەکات خاوەن هێزێکی گەورەی راکێشانە. کەسایەتی ئەمجۆرە پیاو و ژنانە وەک چۆن لەبەرامبەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا دووچاری شکست نایەن، لەمیانەی هەبوونی خۆیانەوە ژیانی ئازادی کۆمەڵگا بونیاد دەنێن. چونکە لە یەکینە تاکانەییەکاندا رێزگرتن و متمانە زاڵە، نەخۆشیەکانی سیستەم لەجۆری ئێرەیی، برسێتی، ناجێگیریو بێزاربوون جێگایان نابێتەوە. لەبەرئەوەی یەکتری ناکەن بەموڵک بانگەشەی ماف بەرامبەر بەیەکتری ناکەن. هێزی مانای هاوسەنگیان لەو دۆخەدایە کە لە کەسێکدا گشت، لەگشتیشدا کەسێک بژێنێت.**

**بزووتنەوەکانی کۆمەڵگای مێژوویی تەنیا لەمیانەی ئەم جۆرە کەسایەتیانەوە بەسەرکەوتن دەگات کەمانای وەهای بەدەست هێناوە. ئەو کەسایەتیانە ناچارن بەمانای راستەقینەی وشەوە وەک سۆسیالیست بناسرێن، یادیان بکرێتەوەو چاوەڕوانیان بکرێت.**

**رەچاوکردنی هەندێک ئەزموونی گرنگی مێژوویی جێبەجێکردنی تیۆری هاوژیانی ئازاد پەرەسەندنی کۆمەڵگای سۆسیالستدا گرنگ و بایەخدارە. لەو بارەیەوە ئایینی کرستیانی ژیانی راهیب و راهیبێتی بۆ کادێرەکانی کردووە بەمەرج. ئەو هەنگاوە رۆڵێکی گرنگی لە پەرەسەندنی شارستانی رۆژئاوادا بینیوە. لەمیانەی ئەو پرۆسەی دەرهەق بەکادیرانەوە پەیڕەوی کردووە کرستیانی خراپییەکانی کۆمەڵگای رەگەزپەرستی سنووردار کردووە. جڵەوەکردنی فشاری زایەندگەری سەر زهینەت لەلایەن روحانیەتەوە رۆڵێکی گرنگی لەپەرەسەندنی کۆمەڵگابووندا بینیووە. بەڵام رێگای لەپێش پەرەسەندنی دیالیکتیکی نەکردۆتەوە کەدەرفەتی هاوژیانی ئازاد دەرەخسێنێت؛ ئەوەی بەشێوەیەکی پەرچەکرداری لەبەرامبەریدا سەریهەڵداوە تەقینەوەی رەگەزپەرستی کۆمەڵگای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بووە. ژیانی مۆدێرنی موڵکداری یەک ژنی وەک شێوازێکی ژیانی دژ بەکولتووری راهیب -ڕاهیبێتی دووەمین خاڵی ئەو پەرگەریو جەمسەرگەرێتی ئافراندووە. کولتووری راهیب -ڕاهیبێتی کرستیانی لەژێر تەنگژەی ژیانی تاک ژنی مۆدێرندا شاراوەیە. لەدەربازکردنی کۆمەڵگای رەگەزپەرستدا هەردوو کولتووریش بنبەستبوون. ئەو راستییە لە تەنگژەی کولتووری کۆمەڵگای رەگەزپەرستی رۆژئاوادا شاراوەیە.**

رێگەچارەی ئیسلامیش سەبارەت بەبابەتەکە سەرکەتوو نەبووە. ئیسلام کە بە پێچەوانەی ژیانی راهیب - راهیبێتی ئەولەویەتی بە تێرکردنی زایەندی داوە، لەو بڕوایەدا بووە کە لەمیانەی فرەژنی و دۆخی کەنیزەکی کێشەکانی لەگەڵ ژن چارەسەر دەکات. پەیڕەوکردنی دۆخی ژنانی حەرەمسەرا لەئیسلامدا بەجۆرێک لەجۆرەکان رۆڵی سۆزانیخانەی تایبەتکراو دەبینێت. جیاوازییەکەی لەگەڵ سۆزانیخانە لەوەدایە کە تایبەت بەچەند کەسێکە، لەناوەرۆکدا جیاوازییەکیان نییە. ئەو کردەوانەی کۆمەڵگای رەگەزگەرا رۆڵێکی دیاریکەریان هەیە لە دواکەوتنی کۆمەڵگای رۆژهەڵات بەرامبەر بە کۆمەڵگای رۆژئاوا. لەکاتێکدا جڵەوکردنی زایەند لەلایەن ئایینی کریستیانیەوە رێگا بۆ مۆدێرنیتە دەکاتەوە، پشتگیریکردن و هاندانی تێرکردنی زێدەڕۆییانەی زایەندی لەلایەن ئیسلامەوە رێگای لەپێش دۆخێکی دواکەتووتر لەکۆمەڵگای جاران و شکست بەرامبەر کۆمەڵگای مۆدێرنیتەی رۆژئاوا کردۆتەوە. رەگەزپەرستی کۆمەڵگا رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ژێرکەوتنی ژن و پیاوی رۆژهەڵات بەرامبەر بە ژن و پیاوی رۆژئاوا. لەمەزندەکان زیاتر رەگەزگەرایی کاریگەری دەکاتە سەرپەرەسەندنی کۆمەڵگا. سەبارەت بەکرانەوەی جیاوازی نێوان کۆمەڵگای رۆژهەڵات و رۆژئاوا پێویستە بەبایەخەوە هەڵوەستە لەسەر رۆڵی رەگەزگەرایی بکرێت. چەمکی رەگەزگەرایی ئیسلام لەبواری قوڵایی بەکۆیلەکردنی ژن و پتەوکردنی دەسەڵاتگەرێتی پیاو بە بەراورد لەگەڵ شارستانی رۆئاوا ئەنجامی زۆر خراپ و نەرێنیتری ئافراندووە.

کاتێک پراکتیکی هاوژیانی ئازاد پێشدەخەین خاڵگەلێکی گرنگ جێگای باسن کە پێویستە لەلایەن ژن و پیاوەوە رەچاو بکرێت. ئەو پێویستیانە بەو شێوەی خوارەوە دەستنیشان دەکەین کە دەبێت ئەو ژنە ئەنجامی بدات کە دەرفەتی ژیانی ئازادی هەیە یاخو خوازیارە ئەو چانسە بەدەست بێنێت:

آ. ئەو هاوبەشی یان پشکدارییە رەگەزییەی ژن لەگەڵ پیاوی ئەنجامیدەدات تەنیا تێربوونێکی جەستەیی رووت نییە، پێویستە پێشتر بزانێت رووبەڕووی چرنوکی هێزو دەسەڵاتێک دەبێتەوە: وەک ئەوەیە لەناو قەفەسدا لەگەڵ پڵنگ بخەوێت. بەتایبەتیش دۆخی برسێتی و دیلی پڵنگەکەی ناو قەفەس لەوانەیە رێگا خۆشکەرێت کە پیاو بەشێوەیەکی کوشندە چرنووکەکانی بەکاربێنێت. پێویستە ژن زۆر بەچاکی بزانێت کاتێک لەمیانەی پەیوەندی هاوسەرگیری کلاسیکەوە کەوتە قەفەسەوە بەئاسانی و بەسەلامەتی دەرناکەوێت، باجەکەی یان گیانی دەبێت یاخود دەبێت بە پڵنگێکی مێینەی خۆبەدەستەوەدەر. بەمجۆرەش پڵنگی مێینە نوێنەرایەتی ژنی بەپیاو بوو دەکات. ئەمەش قێزەون و چەپەڵە. پەیوەندی زایەندی نێوان پیاوی هەژموونگەراو ژنە پیاوانەکەی تەواو رادەستی بووە رۆڵی سەرەکی دەبینێت لە روودانی ئەو قێزەونی و چەپەڵیەدا. لەکاتێکدا پیاوان بەسەرفرازییەوە رۆژی "دڕاندنی پەردەی کچێنی" ئافرەت بەسەر دەبن، هۆکارەکەی تێربوونی ئارەزوو (دیاردەی جەستەیی) نییە، بەڵکو پشکی ئەو پەیوەندییەیە لە دروستبوونی پەیوەندی دەسەڵات - کۆیلەدا. دڕاندنی پەردەی کچێنی سەرەتای مەحکومکردنی ژنە بە کۆیلایەتی بێ کۆتاوە. رێگا لە پێش سۆزو هەستی دەسەڵات و سەرداری دەکاتەوە. ئەمەش مانای سەلماندنی پیاوێتی دەبەخشێت. دواتر ئەو رێبازە لەسەر کوڕە لاوەکانیش پەیڕەو دەکرێت. دامەزراوەی کۆیلایەتی لەسەر هەردوو رەگەزیش پەیڕەوکرا. هێندەی پیاو بەپەرۆشنەبوونی ژنان و رانەکردنیان بەدوای پەیوەندی زایەندیدا پەیوەندی بەدامەزراوەی کۆیلایەتیەوە هەیە. چالاکی زایەندی کە بەشێوەیەکی بێسنوور لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە زیادکراوە، بەرفراوانترین ئامرازی کۆیلایەتییە کە بەسەر جۆری مرۆڤدا سەپێنراوە؛ رێگا لەپێش دەرفەتێکی بێ سنووری دەسەڵات و چەوسانەوە دەکاتەوە. هەڵوێستی بەگومانی زۆربەی ئایینەکان بەرامبەر بەو پەیوەندییە مانادارە، پەیوەندی بەرێخۆشکردن بۆ کەوتن، چەپەڵی و دەرکەوتن لە حەقیقەتەوە هەیە.
ب. ئەگەر لەدۆخی هاوسەرێتیەکی هاوتادا نەبێت، پێویستە ژن ئاگادار بێت کە پیاو بەردەوام بەسایکۆلۆژیای پڵنگ رەفتار دەکات و هەر ساتێک بۆ راوکردنی نێچیرەکەی ئامادەیە، پێویستە بەگوێرەی ئەوەش شێوازی جموجۆڵو رەفتاری خۆی دەستنیشان بکات. کاتێک پیاوی پڵنگی دەرفەت ببینێت، واتە رووبەڕوی بەربەستێکی کۆمەڵایەتی بێتەوە کە توانای دەربازکردنی هەبێت مسۆگەر چرنوکێک لە ژن دەوەشێنێت. لەو ساتەدا پیاوی دەسەڵاتگەرا هیچ پاساوێکی ئەخلاقی و ویژدانی ناناسێت و خوازیارە ژن راو بکات. نە بەرگی ئایینی و نە یاسا هیچ یەکێکیان لەبەردەم ئەودا کۆسپ نین. پێویستە ژن ئاگاداری ئەو رەوشە بێتو بەگوێرەی ئەمە دابەزێتە مەیدانە کۆمەڵایەتیەکانەوە. بەمانایەکیتر بەبێی گەرەنتی بەرگرییەکی خۆیی کارا بۆ مەیدانە کۆمەڵایەتیەکان دانەبەزێت.

ج. پێویستە زۆر باش بزانێت کە ئامانجی سەرەکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەمیانەی بەکارهێنانی پارەو ڕێبازە توندوتیژەکانی گوزارشت لە هێزی دەسەڵات دەکەن و ڕێبازی نەرمیش کە هێزی هونەر لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەدەبیات پیشان دەدات؛ ژن بکات بە کۆیلەیەکی مۆدێرن. لەرێگای دەسەڵاتەوە بێت یان بەڵێنە بەردەوامەکانی ئەشقەوە مۆدێرنیتە چەندین قات هێندەی پیاوی کۆمەڵگای کۆن زیاتر بەرامبەر بە ژن لە پێگەی هێزی هێرشبەردایە. بەرامبەر بەهێزی پارەو ئەشقی پیاوی مەترسیدارو باڵادەست بە دواداچوون و لێگەڕینی ژن بۆ ژیانی ئازاد جگە لە خەیاڵێکی پووچ هیچ مانایەکی دیکە نابەخشێت. بەو هەموو ڕەفتارە جوان و دڵسۆزیەیەوە چەندە هەڵوێست بنوێنێت و بەدوای هاوژیانی ئازاددا هەوڵ بدات، بەرامبەر بەپیاوی مۆدێرنیتەی دەستبەکار لە دۆڕاندن ڕزگاری نابێت. واتە هەر ڕێگایەک بەرەو کۆیلایەتی مۆدێرنی ژن دەچێت.

د. وێڕای تەواوی ئەو کۆمەڵگا پیاوسالارییە ئەگەر ژن لەسەر ئازادی سووربێت، ئەوکاتە پێویستە بەرگەی ژیانێکی تەنیایی مەزن یان زەحمەتیەکانی میلتانێتیەک بگرێت کە هەر ساتێکی پڕ لە تێکۆشانی سۆسیالیستانە بەسەر دەچێت. تەنیا بۆ دۆخە مارژینال و بێکاریگەرەکان جێگای باسە. هەرچی ژیانی سۆسیالیستانەیە پێویستی بە ژیانی مێخوداوەند هەیە کە لەگەڵ کولتووری کۆنی مێخوداوەند هاوتابێت. پێویستە ئەو خاڵە ڕەچاو بکات یەکێک لە تایبەتمەندێتیەکانی مێخوداوەندێتی هاوسەرگیری لەگەڵ پیاو نەدەکرد. وەک لەدیرۆکەوە ئاگادارین کاتێک پیاویش بوو بەخوداوەند شوێن پەنجەیەکی ئەوتۆی مێخوداوەند دیار نەمابوو. ئەوەی دەمێنێتەوە بەفریشتە بوونە. بەڵام ئافرەتی فریشتە نوێنەرایەتی ئەو ژنە بێ هێزە دەکات کە تۆزێک هێزی ڕەگەزی لەدەستداوە. ڕۆڵی ئەو چەشنە ژنە لەناو کۆمەڵگادا دۆخی پەیامبەری تێپەڕ ناکات. شێوەی ئینانا- ئەفرۆدیتی میتۆلۆژیا ژنێکی جیاوازترە. نوێنەرایەتی خەیاڵی ئەو ژنە دەکات کەهێشتا جوانی، سەرنجڕاکێشی ڕەگەزی و هێزی جەستەیی خۆی لەدەستنەداوە. ئینانا-ئەفرۆدیت بەسیفەتی مێخوداوەندی ئەشق ئەو فاکتەرەیە کە پەیجۆری هاوژیانییە. ئەو فاکتەرەیە کە هاوبەشێتی هاوژیانی ئازاد دەکات. پێویستە باش تێبگەین کە فاکتەرێکی بەمجۆرە تەنیا دەشێت پیاوێکی پرۆمۆتۆسی نیمچە- خوداوەند- مرۆڤ بێت. لەدیرۆک و ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەو فاکتەرە یاخود پیاوە تەنیا دەشێت وەک شێوەیەک وێنابکرێت. بەرجەستەکردنیشی تەنیا دەشێت لەئاکامی تێکۆشان و جەنگاوەرێتیەکی نائاسییەوە بەدیبێت. تا خوداوەندە رووتەکان تێکنەشکێنێت کە بەهێزە مەترسیدارەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە چەکدارکراون ناتوانێت خۆی بئافرێنێت. ئەمە ئافراندنێکی زەحمەتە بەڵام مەحاڵ نییە. سۆسیالیست بوون تاڕادەیەک لەمیانەی بەرجەستەکردنی خەیاڵی ئینانا- ئافرۆدیت و پرۆمیتۆس بەدیدێت.

ئەو هەنگاوانەی پێویستە پیاوی پەیجوری هاوژیانی ئازاد بیهاوێژێت دەتوانین بەم شێوەیە کورتیان بکەینەوە:

آ. پێویستە ئەو پیاوە بزانێت ئەو ژنەی بەرامبەر قووت کراوەتەوە لەژێر سایەی شارستانی پێنج هەزار ساڵی و هەژموونگەرایی پێنجسەد ساڵەی سەرمایەداری دووچاری هەلومەرجەکانی هەموو جۆرە کۆیلایەتیەک هاتووە. تاکە ڕێگەچارەی ئەو ژنە بەرامبەر پیاوی پلنگی ئەوەیە کە ببێتە مێینەیەکی پلنگی. سەرجەم ستراتیژو تەکتیکیەکانی ژیانی بەشێوەیەکی ساتەوەختی لەسەر ئەو بنەمایە بونیادنراوە. ئەگەر بەپێچەوانەوە بیخوێنینەوە. ئەویش بەگوێرەی خۆی قەفەسێکی هەیە کەخوازیارە تاکە نێرەکەی تێدا بەند بکات. ئەگەر پیاو بەدوای هاوژیانی ئازادا بگەرێت، ئەوا ڕزگاربوونی لە ستراتیژی و تەکتیکەکانی ئەم چەشنە ژنە بەلانی کەم هێندەی ژنە کۆیلەکە زەحمەتە. ڕزگاربوون لە ستراتیژو تەکتیکەکانی ئەو چەشنە ژنە کە بەسیفەتی دژە کۆیلایەتی دیسەپێنێت بۆ ئەو پیاوەی بەدوای هاوژیانی ئازادەوەیە پێویستە بوارێکی لەپێشینەی تێکۆشان بێت، لێرەدا سەرکەوتوو نەبێت تەنانەت تاکە هەنگاوێکیش بۆ تێکۆشانی کۆمەڵگای سۆسیالیستانە ناهاوێژێت.

ب. ئەو پیاوەی لەدۆخی هاوسەرگیریدایە پێویستە ئاگاداربێت کە بەلانی کەم هێندەی ژن دووچاری کاریگەریەکانی دامەزراوەی کۆیلایەتی هاتووە. لەپێناو دەربازکردنی کاریگەرییە نەرێنیەکانی دامەزراوەکە لەجیاتی ماڵ پێویستە ئەو پیاوە بەردەوام بەدوای ژیانی سۆسیالیستیانەوە بێتو هەوڵی بۆ بدات. ژیان لەگەڵ ژنی کۆیلەدا ژیانێکی کۆیلایەتییە، ژیانێکی چەوت. دەربازکردنی کولتووری سۆزانیخانەی تایبەتکراو پێویستی بە سەرکەوتن لەبواری دەستەبەرکردنی کولتووری هاوژیانی ئازاد هەیە.

ج. بەرامبەر تەواوی ئەو فاکتەرە نەرێنیانە لەپێناو هاوژیانی ئازاد بەلانی کەم هێندەی ژنی ئازاد پێویستی بەتێکۆشانی پیاوی ئازاد هەیە. بەپێچەوانەوە پیاوێتی ئازاد تەنیا لەمیانەی دەربازکردنی کەسایەتی ئەو پیاوە بەدیدێت کە کۆمەڵگای پیاوسالاری کردوویەتی بەکۆیلە. پێویستە پایەی عاریفی بەدەست بنێنێت کە تا ئێستاش لەڕاستینەی کۆمەڵگاکەماندا پەسەندکراوە. بەو رادەیەی "مرۆڤ وەک پیاو لەدایک نابێت، بەڵکو مرۆڤ دەبێت بە پیاو"، وەک پیاو شارستانی لەدایک دەبێت. بەڵام دەبێت بە پیاوی ئازادیش. لەو سەردەمەماندا تەنیا لەمیانەی زانست، فەلسەفە و مۆدێرنیتەی دیموکراتیکەوە خەیاڵی پیاوی پرۆمیتۆسی بەرجەستە دەبێت. پێویستە بەبایەخەوە تێبگات کە میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە زانست و هونەر لەپێناو ژیانن و رۆڵی سەرەکیشی بەرجەستەکردن و ئاواکردنی هاوژیانی ئازادە، هەربۆیەش ئەوە بکات بە ئەخلاق و ئەستەتیکا. هاوسەرێتییە هاوچەرخەکانی ئێستا بەردەوامی کولتووری پلەداری خانەدانێتی (کولتوورێکی نزیکەی حەوت هەزار ساڵییە) یە، یەو سیفەتەی سەرەکیترین بواری ئافراندنی بەهاکانی کۆمەڵگای دەوڵەتییە، لە بەرزترین ئاستدا بەشێوازی نامووس و نۆرم دەستدرێژی دەرخواردی کەسایەتی ژن و پیاو دراوە. پێویستە نەبوونی ئەشق، لێکجیابوونەوەو هەڵوەشانەوەی خێزان وەک ئاکامی کولتووری دەستدرێژی ببینرێت کە بەئامانجی دەسەلات و چەوسانەوە لە کەسایەتیەکان بارکراون. کۆمەڵگای ئازاد و سۆسیالیست تەنیا لەلایەن ئەو کەسایەتیانەوە دەئافرێنرێت کە بەرامبەر بە کولتووری دەستدرێژی سات بەسات بە فەلسەفە، زانست، ئەخلاق و ئەستاتیکا بارکراوە. ئاشکرایە ئەو هاوژیانە ئازادانەی لەسەر ئەو بنەمایە ئاوا دەکرێت بەردەوام جوانی، راستی و چاکە بۆ تاک و کۆمەڵگا بەرهەم دێنێت.

ئەو ژیانە پەرچوویی و تەسلیماوییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وێرانی کرد تەنیا لەمیانەی هاوژیانی ئازاد، کەسایەتییە سۆسیالیستەکەی و تێکۆشانە کۆمەڵایەتیەکەی بەدەست دەهێنرێتەوەو دەتوانین هاوبەشێتی تێدا بکەین. لەو پێناوەشدا پێویستە هەر لەمنداڵییەوە بەتایبەتیش کیژۆڵە بچووکەکانمان لەمیانەی زهنیەت و دامەزراوەکانی تازەگەری دیموکراتیەوە پەروەردە بکەین، لە رێگای تێکۆشانی کۆمەلایەتی سۆسیالیستی دیموکراتیانەوە جێبەجێی بکەینو وەک شێوازی ژیانمان پەسەندی بکەین، ناوەرۆکەکەی پەرەپێبدەین و بەدەستی بخەین.

لەو بارەیەوە پرسیارێکی دیکەی جێگای مەراق سەبارەت بە شێوازی ژیانە لەگەڵ ژندا. لەتەواوی بەرگرینامەکاندا ناوە بەناوە باسی چۆنێتی ژیانم لەگەڵ ژندا کردووە. بەتایبەتیش لەهەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەدا ژیان لەگەڵ ژن گرنگیەکی مەزنی هەیە. ئەوە کێشەیەک نییە لەمیانەی داخوازی کردن، گەڕان بەدوای ژن و فریودانی، یاخود بەیەکەوەبوون لەرێگای خانەی "گشتی " یان "تایبەت"و بەیەکەوە ژیانی منداڵدار یان بێ منداڵ چارەسەر بکرێت. لەپێناو چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی گۆشەی سەرەکی دڵ و مێشکی کێشە کۆمەلایەتیەکانی داگیرکردووە پێویستە هەڵوێستی زانستی، فەلسەفی، ئەتیک و ئەستاتیک بەبنەما بگیرێت. لەهەلومەرجەکانی ئەو سەردەمەماندا، واتە لەهەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هاوژیانی ئازاد لەگەڵ ژن ژیانێکە پێویستی بە بەر پرسیارێتیەکی گەورەو هێزی هەڵوێستی زانستی، فەلسەفی، ئەتیک و ئەستاتیک هەیە. بەبێ زانینی ئەو ستاتۆیەی لەمێژووی شارستانی و مۆدێرندا ژنی تێناخێنراوە، بەبێ پیشاندانی هێزی هەڵوێستی ئەتیک و ئەستاتیک، کامە چەشنی بەیەکەوە ژیان تاقی بکرێتەوە ئەوا بەچەوتی، بێ ئەخلاقی و فێزەوەنی ئەنجامگیردەبێت.

لەپێناو بە فیرۆنەدانی ژیان بەر لەهەموو شتێک فەراهەمکردنی شێوەی راست، ئەخلاقی و ئەستاتیکەکانی ژیان لەگەڵ ژندا مەرجە. شیکارکردنی ناسنامەی ژن کە هەموو جۆرێکی کۆیلایەتی لەسەر کەسایەتییەکەی تاقی کراوەتەوە و ناچاری هەرسکردنی کراوە، بوون بە هاوڕێ و هاوژیانی دۆزی یەکسانی و ئازادی مەرجی سەرەکی بوونە بەپیاوێکی راست، جوان و بەئەخلاق. ئەگەر خوێندنەوەیەکی راست بۆ دێرەکانی بەرگرینامە بکرێت، ئەوا باشتر روون دەبێتەوە کە بۆچی گرنگیم بەو شێوازەی ژیان داوەو کردوومە بە پرەنسیپ. بەمجۆرەش باشتر دەرکی پێدەکرێت. شێوازی ژیانی رەگەزپەرستی کە ئەخلاقی شارستانی تەوەرەی دەسەلاتی مۆدێرنیتە سەپاندوویەتی و لەناو هەڵوێستێکی بەربەرێتی " دڕاندنی " کچێتی ژندایە، فێزەونی و بێ ئەخلاقیەکی گەورە بەرهەم دێنێت. ئەگەر بەشێوەیەکی راست دەرک بەتێکۆشانە گەورەکەم بەرامبەر ئەو شێوازەی ژیان و دەرەنجامەکانی بکرێت

ئەوا ژیان لەگەڵ ژن جوان و بە ئەخلاقانەتر دەبێت. لەو پێناوەشدا پێویستە هەر ژن و پیاوێکی هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەن بەردەوام هەڵوێست و پراکتیکێکی زانستی، فەلسەفی، ئەتیک و ئەستاتیک پێشبخەن تا بەتایبەتی ژن ئازاد و بەهێز بێت و لەسەرجەم مەیدان و بوارە کۆمەڵایەتیەکاندا ئاستێکی یەکسان و هاوتا بەدەست بێنێت، ئەمەش لە زهنیەت و دامەزراوەکانی نەتەوەی دیموکراتدا بەرجەستە بێت.

وەک ئاگادارین هەر یەکینەیەکی ژیانی زیندوو سێ چالاکی سەرەکی هەیە. ئەوانەش خۆراک پەیداکردن، پاراستنی بوون و درێژە پێدانی رەچەڵەکن. نەک تەنیا ئەو یەکینە بایۆلۆژیانەی بە ژیانی زیندوو ناوی دەبەین، بەڵکو هەر بوونەوەرێکی گەردوونی رۆڵێکی زیندووی بەگوێرەی خۆیان دەبینن چالاکی هاوشێوەیان هەیە. ئەو چالاکییە سەرەکیانە لە مرۆڤ بە ئاستێکی جیاوازتر دەگات. لەکۆمەڵگای مرۆڤدا راسیۆناڵی بە ئاستێکی ئەوتۆی پەرەسەندن دەگات، ئەگەر دەرفەتی پێبدرێت ، لەوانەیە کۆتایی بە بوونی سەرجەم زیندەوەرە بایۆلۆژیەکانی دیکە بێنێت. ئەگەر جیهانی بایۆلۆژی لە ئاستێکی دیاردا بوەستێنرێت، ئەوا نابەردەوامی جۆری مرۆڤیش لەخۆیەوە روودەدات. ئەوە دووفاقیەکی جدییە. جۆری مرۆڤ کە لە ئێستاوە ژمارەکەی بە حەوت ملیار گەیشتووە بەو خێرایيە لەزیادبوونادا بێت، ئەوا دوای ماوەیەکی زۆرکورت ئاستی بایۆلۆژی دەرباز دەکرێت و نابەردەوامی ژیانی مرۆڤ دێتە ئاراوە. راسیۆنالستی مرۆڤ رێگای لەپێش ئەو دۆخە کردۆتەوە. لەو سۆنگەوە پێویستە بەر لە گەیشتنی بە ئاستی بایۆلۆژی، هەمان راسیۆنالیتە زیادبوونی زێدەڕۆیانەی ژمارەی جۆری مرۆڤ بوەستێنێت. پەیدابوون و زۆربوون رووداوێکی زۆر سەیرە. ئامێرێک کە دەشێت بە ئەقڵی سروشت ناوی ببەین بەردەوام رۆڵی هاوسەنگ کردن دەبینێت، هاوسەنگی نێوان بوون و زۆربوون دەپارێزێت. بەڵام بۆ جاری یەکەمین راسیۆنالیستی مرۆڤ بە رووی ئەو میکانیزمەی هاوسەنگی دەوەستێتەوە. لەراستیدا دەستەواژەی ئیلاهیبوونیش زادەی ئەو راسیۆنالیتەیە. خوداوەند مانای ئەو مرۆڤەیە کە لە راسیۆنالیتەدا سنوور ناناسێت. تایبەتمەندێتییە راسیۆنالەکانی مرۆڤ رێگای لەپێش بونیادنانی خوداوەند، ئایین و سیستەمە ئافرێنەرەکانی دیکە کردۆتەوە.

خۆلەتکردن و زۆربوونی یەکخانە (ئەمیبیا) بەرامبەر بە لەناو چوون، سەبارەت بەبەردەوامی ژیان مایەی تێگەیشتنە. رەمەکی زۆربوونی هەر بوونەوەرێک تادەگاتە مرۆڤ گوزارشت لە ئارەزووی ژیانی بێ کۆتایی دەکات. ئارەزووی ژیانی بی کۆتایی، ئارەزووێکە دەرکی پێنەکراوە، تواناو بەهرەی تێگەیشتنی زۆر سنووردارە. پێویستی یان پێویست نەبوونی گەیشتن بە مەعریفەی ژیان گفتوگۆیەکی جیاوازترە. بەڵام ئەوەش مایەی تێگەیشتنە کە دوای گەیشتن بە مەعریفەی ئارزووی ژیان لەمیانی درێژەدان بە رەچەلەکەوە مانای ژیان بەدەست ناهێنرێت. ژیانی کەسێک و ملیۆنان کەسیش هەمان شتە. وەک چۆن زۆربوون ژیان مانادار ناکات، لەوانەیە هێزی مەعریفەی دەرکەوتووش چەواشەو لاواز بکات. بەدەستهێنانی زانیاری و مەعریفە لەبارەی خۆیەوە، هیچ گومانی تێدا نییە پێکهاتەیەکی سەمەرەی گەردوونە. لەخۆیەوە نازناوی خوداوندێتی بەباڵا نەکراوە. دوای بەدەستهێنانی هێزی مەعریفە دەرهەق بەخۆیەوە، ناشێت کێشەی سەرەکی مرۆڤ بەردەوامکردنی رەچەڵەک بێت. درێژەپێدانی رەچەڵەک لەلایەن مرۆڤی وشیار و خاوەن مەعریفەوە تەنیا بە تێکدانی هاوسەنگی دژ بە زیندەوەرانی دیکە ناوەستێت، بەڵکو هێزی مەعریفەی مرۆڤیش دەخاتە مەترسیەوە. بەکورتی کێشەی سەرەکی مرۆڤی خاوەن مەعریفە بەردەوامکردنی رەچەلەک نییە. سروشت لە مرۆڤدا بە ئاستێکی وەها گەیشتووە درێژەپێدانی رەچەلەکی خۆی لەدۆخی کێشە دەرخستووە. لەوانەیە بڵێن هاوشێوەی بوونەوەرانی دیکە رەمەکی بەردەوامکردنی رەچەلەک لەمرۆڤیشدا ئەبەدییە و هەر بەردەوام دەبێت. راستە، بەڵام ئەوە راستیەکە لەگەڵ هێزی مەعریفە ناکۆکە. لەو سۆنگەوە دەست لێبەرنەدراوە کە لە پێشینەیی بۆ مەعریفەیە. بەو رادەیەی دەزانین ئەگەر گەردوون بۆ یەکەمین جار لەمرۆڤدا بەبەرزترین ئاستی خۆ ناسینی خۆی گەیشتووە، پێویستە جێگای جۆش و خرۆشێکی مەزن بێت، واتە تێگەیشتنی گەردوون لەوانەیە مانای راستەقینەی ژیان بێت. ئەوەش مانای دەربازکردنی خولگەی نەزۆکی ژیان ـ مردنە، ناشێت بیر لە خرۆشان و جەژنێکی گەورەتری تایبەت بەمرۆڤ بکرێتەوە. ئەوەش بەجۆرێک لە جۆرەکان گەیشتنە بە نیروانا، فەنافیلالاو مەعریفەی رەها، لەوە زیاتریش نە مانای ژیان دەمێنێت ـ نە پێویستی بەختەوەری.

لە کۆمەڵگای کوردا دەشێت پووکانەوەی ژیان زیاتر لە چوار دەوری دیاردەی ژن ببینرێت. لەکولتورێکی کۆمەڵایەتیدا کەبە شێوەیەکی زۆر واقیعیانە ناوی ژن و ژیانی کردووە بە یەک، کۆتایی هاتنی ژیان لەژندا نیشانەی سەرەکی لەناوچوونی

کۆمەڵایەتیشە. ئەوەی لە پاشماوەی کولتوورێکدا ماوەتەوە کە ڕێگای لەپێش کولتووری مێخوداوەند کردۆتەوەو لە دەوروبەری ژن بناخەی شارستانی داناوە؛ نابینایییەکی مەزن و ئالوودەبوونێکی رادەستبووی رەمەکەکانە سەبارت بە ژیان لەگەڵ ژندا. نەریتەکان و ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیەی لەژێر مەنگەنەی نکوڵی و قڕکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدایە، ژیانێکە بە تەواوی مەحکومی بێچارەیی ژن کراوە. وەک بڵێی دوا سەنگەرە لەدەستیدا مابێتەوە، چەمکی نامووسی پشتبەستوو بە ژن گوزارشت لەدۆخێک دەکات کە زۆر لەو مانایە دوورکەوتۆتەوە کە نامووس (نۆمۆس)=بێت بە ڕێسا یاخود یاسا. نامووس پەرستیەکی توندی سەبارەت بە ژن، گوزارشت لەبێ نامووسیەکی زۆر توندی کۆمەڵایەتی دەکات. چەندە لە نامووسی کۆمەڵگا دوورخرابێتەوە، واتە لەو بەها سەرەکیانەی لەسەر پێیانی دەهێڵنەوە دوورکەوێتەوە یاخود دووربخرێتەوە بەو رادەیە نامووس پەرستی ژن دووفاقییە. تێنەگەیشتنی کوردان لەو ڕاستییەی کە دوای لە دەستدانی نامووسی کۆمەڵگا ناتوانن نامووسی ژن بپارێزن تەنیا جەهالەت یاخود نەزانی نییە، بەڵکو بێ ئەخلاقییە بە ناوی ئەخلاقەوە. ئەو چەمکەی نامووس کە لەژێر ناوی نامووسی ژن هەوڵی ژیانکردنی دەدرێت، سەرچاوەی خۆی لە سەلماندنی هێزی یاخود بێ هێزی پیاو لە کۆیلایەتی ژن وەردەگرێت: بێگومان ئەو پیاوە کوردەی لەبواری ئەخلاقی و سیاسیەوە لەناوچووە. خوازیارە ئازاری ئەو کردەوانەی باڵادەستی بیانی بەسەر خۆی و کۆمەڵگاکەی سەپاندووە، لە میانەی سەپاندنی باڵادەستی خۆی بەسەر ژندا دەربخات یاخود هەڵیانڕێژێت. بەجۆرێک لەجۆرەکانی خۆی خاڵی دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەی لەتەواوی جیهان دۆخی ژن زۆر قورسە بەڵام ئاشکرایە کە لە هیچ شوێنێک کۆیلایەتیەکی قورسی هاوشێوەی ستاتۆی ژنی کورد جێگای باس نییە. فرەمنداڵی کە دۆخێکی گشتییە ڕووێکی دیکەی ئەو ڕاستیەیە. لە کۆمەڵگا هاوشێوەکاندا ئەو تاکە چارەسەرییە یاخود بێچارەیییەی لە ئاکامی نەزانی و کۆیلایەتیەوە دەرهەق بە بەردەوامکردنی بوون دێتە ئاراوە خستنەوەی منداڵێکی زۆرە. ئەوە دیاردەیەکە لە هەر کۆمەڵگایەک ڕوودەدات کە مەعریفە و هۆشیاری زاتی (خۆیی) تێدا پێشنەکەوتووە. دووفاقیەکە لێرەدایە، لەبەر ئەوەی فاکتەرە دەست لێبەرنەدراوەکانی دیکەی ژیان ئاسایش و خۆراک لە ئاردانین، منداڵی زۆر ڕێگا لەپێش کێشەگەلێکی گەورە دەکاتەوە. بێکاری هەرەس ئاسا گەورە دەبێت. هەڵبەتە ئەوەی سیستەمی قازانجی سەرمایەداری بۆ کۆیلایەتی هەقدەستی کەم پیویستێتی زیاد بوونی زێدەڕۆیانەی ژمارەی دانیشتوانە. نەریتی شارستانی و مۆدێرنیتە دەستی یەکتریان گرت و بەمجۆرە تەواوی وێرانکاریەکان لەسەر ژن ئەنجامدەدات.

لە پرۆسەی نەتەوەبوونی دیموکراتدا ئازادبوونی ژن بایەخێکی زۆری هەیە. ژنی ئازاد کۆمەڵگای ئازادە. کۆمەڵگای ئازادیش نەتەوەی دیموکراتە. باسی گرنگی شۆڕشگێڕانەی پێچەوانەکردنەوەی ڕۆڵی پیاومان کرد. ئەوەش مانای ئەوەیە لەجیاتی درێژەدان بە ڕەچەڵەک و باڵادەستی لەسەر پشتی ژن، بەهێزی خۆی بەردەوامی بەنەتەوەبوونی دیموکراتیک بدات، هێزە ئایدیۆلۆژی و رێکخستنیەکەی ئاوا بکات و نفوزی سیاسی خۆی زاڵ بکات؛ واتە خۆ ئافراندنێتی لەبواری ئایدۆلۆژی و سیاسیەوە. لەجیاتی زۆربوونی جەستەیی پێویستە زیاتر بەهێزبوونی زهنی و روحی بەدەست بێنێت. ئەو راستیانە سروشتی ئەشقی کۆمەڵایەتی بەدیدێنن. بەدڵنیایەوە پێویستە ئەشق بۆ هەستگۆڕینەوە و کەمەندکێشی زایەندی نێوان دووکەس بچووک نەکرێتەوە. بگرە پێوستە گیرۆدەی ئەو جوانییە رووکەشیانە نەبین کە مانای کولتوورییان نییە. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سیستەمێکە لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی ئەشق ئاواکراوە. نکوڵیکردنی کۆمەڵگا، هاربوونی تاکڕەوێتی، داگیرکردنی هەر بوارێک لەلایەن رەگەزپەرستیەوە، بە ئیلاهیکردنی پارە، جێگیرکردنی دەوڵەت . نەتەوە لە جێگای خوادوەند، گۆڕینی ژن بۆ ناسنامەیەکی بێ کرێ یاخود خاوەن کەمترین هەقدەست مانای بناخەی ماددی نکۆلیکردنی ئەشقە.

پێویستە زۆر بە باشی سروشتی ژن بناسین. نزیکبوونەوە لەسەر بنەمای سەرنجڕاکێشی بایۆلۆژی زایەندی ژن و لەو چوارچێوەیەشدا پەیوەندی بەستن لەگەڵ ژن هەر لەسەرەتاوە مانای لە دەستدانی ئەشقە. وەک چۆن بەیەکگەیشتنە بایۆلۆژیەکان بەشق دانانێین، ئەوا جوتبوونی زایەندی بایۆلۆژیش بە ئەشق ناو نابەین. دەشێت ئەوە بە چالاکییە ئاساییەکانی زۆربوونی بوونەوەران ناوببەین. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو چالاکیانە بگرە پێویست ناکات مرۆڤیش بیت. هەڵبەتە مرۆڤەئاژەڵەکان بە ئاسانترین شێوە ئەو کردار یاخود چالاکیانە بەڕێوە دەبەن. ئەوەی خوازیاری ئەشقی راستەقینەیە پێویستە دەستبەرداری ئەو زۆربوونەی مرۆڤ . ئاژەڵیانەبێت. بەو رادەیەی هەڵسەنگاندنی ژن وەک ئۆبژەیەکی کەمەندکێشی زایەندی دەرباز بکەین، دەتوانین ژن بکەین بە هاوڕێ و دۆستێکی بەهادار. زەحمەتترین پەیوەندی، ئەو هاوڕێتی و دۆستایەتیەی ژنە کە رەگەزپەرستی دەربازکردووە.

**تەنانەت ئەگەر لە هەلومەرجەکانی هاوژیانی ئازادیش ژیان لەگەڵ ژن جێگا باس بێت پێویستە ئەو دۆخە دەرباز بکەین کە بەردەوام وەک سنووری نەریتیەکان و مۆدێرنیتە ژن لە رۆڵی خێزان، دایک، خوشک و خۆشەویست دابنێین. بەر لەهەموو شتێک پێوستە پەیوەندی بەهێزی مرۆڤ لەسەر بنەمای یەکێتی ماناو مرۆیبوونی کۆمەڵگا زاڵ بکەین. ئەگەر گەرەک بێت پێوستە ژنێک یاخود پیاوێک دەسبەرداری هاوسەرەکەی، مناڵەکەی، دایک، باوک و خۆشەویستەکەی بێت بەڵام هەرگیز دەستبەرداری رۆڵە سیاسی و ئەخلاقیەکەی ناو کۆمەڵگا نەبێت. پیاوی بەهێز هەرگیز لە ژن ناپارێتەوە، بەدوای ناکەوێت، لێی نادات، جنێوی پێنادات و ئیرەییشی پێنابات. تەنانەت ئەگەر هاوژین و خۆشەویستەکەشی بێت، کاتێک داوای جیابوونەوە بکات پەنجەیەکیشی بۆ نابات. بگرە ئەگەر رەخنەشی هەبێت دوای ئاراستەکردنی رەخنەکانی لە بەسەربردنی ژیانی خوازراوی یارمەتی دەدات. ئەگەر بیەوێت پەیوەندیەکی لەگەڵ ژندا هەبێت کە بناغە ئایدۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەکەی بەهێز بێت، پێویستە بژاردەو لێگەڕین بۆ ژن جێ بهێڵێت. چەندە ئاستی ئازادی ژن، بژاردەی ئازاد، بزاوتی پشتبەستوو بە ئیرادەی خۆیی پەرەبسەنێت ئەوا دەتوانێت بەشێوەیەکی جوان و مانادارتر لەگەڵ ئەو ژنەدا بژیت.**

**نموونەبیترین هاوژیانی ئازادی نێوان ژن و پیاو لە هەلومەرجی رۆژی ئەمڕۆمان و راستینەی کۆمەڵایەتیماندا ئەوکاتە بەدیدێت کە سەرکەوتنی مەزن لە کاروخەباتە قورسەکانی بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات بەدەست بهێنرێت. لە کوردستانی رۆژی ئەمرۆماندا دیالیکتیکی ئەشقێکی مانادار لەراستی کۆمەڵگای کورد تارادەیەکی زۆر پێویستە پلاتۆنیک بێت. ئەو ئەشقە بەهادارە. ئەشقی پلاتۆنیک ئەشقی فیکروکردارە. هەر بۆیە بەهادارە. ژیانێکی بەردەوام لەگەڵ ژنێکی شاجوانی جیهان ئەشق نییە. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی ئەشق نییە، ماوەیەکی کورت دوای بەیەکەوە بوون دووڕوویی دەردەکەوێت. چونکە سەرچاوەی خۆی لە پەیوەندیەک وەردەگرێت کە بێ مانا ئاواکراوە یاخود بنەماکەی جەستەییە. لەبەرامبەر ئەوەشدا لە پراکتیکی پەکەکە و کەجەکەدا چەندین کوڕو کچی لاوی کۆیلەی دوێنێ بوون، بەبێ ئەوەی بەیەکەوە بن و جووتبن، لەمیانەی ئەشقێکی پلاتۆنیەوە کاری گەوریان لە بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات ئەنجامداوە و هێزی کەسایەتی خۆشیان سەلماندووە. لەو بارەیەوە بەسەدان شەهیدی هێژاو قارەمانمان هەیە. ئەوانە ئەو گەورە لەهەنگانەن کە بوونەتە مەم و زین.**

**بەو بۆنەیەوە ئاماژەکردن بە ئەزموونەکانی خۆم بەقەرز دەزانم. ئەوەندەی لەیادمە هەر لەتەمەنی منداڵیدا یاریکردنم لەگەڵ کیژۆڵان بە پێویستیەکی ئازادی دانابوو. لەکاتی شوکردنیان، خوشکەکانیشم لەناودا هەستێکم لادروست ببوو وەک بڵێی هەموویانم لەدەستداوە. کە تۆزێک گەورە بووم و رووبەڕووی ئەخلاقی نامووسی وشکی کۆمەڵگا بوومەوە بە تەواوی پاشەکشێم کرد. بەڵام ئەوە پاشەکشەیەک بوو کە بە دڵشکاوی بەسەر چوو. هێدی هێدی تێدەگەیشتم کە لەمێژە ژنانمان لە دەستداوە. هەرگیز لەو ستاتۆیە رازی نەبووم کە لەنێوان ژن ـ پیاو ئاواکرابوو. بەردەوام گومانم هەبوو کە ئەو ستاتۆیە لەسەر هەڵە دامەزراوە. ستاتۆیەک بوو پەسەندم نەکرد. لەمیانەی پشتبەستن بەو ستاتۆیەوە هیچ کاتێک داخوازیم بۆ ژن پێشنەکەوت. لەو بڕوایەدام هەر لەتەمەنی بچووکیمەوە دایکم دەرکی بەو دۆخەم کردبوو، هەربۆیەش پێی گوتبووم " بەو دۆخەتەوە ناتوانیت لەگەڵ ژن بیت " لەراستیدا منیش هیچ کاتێک نەمویستوە ببمە خاوەن ژنێک. بگرە داواشم بکردایە نەمدەزانی چۆن بژیم. کاتێک گەورە بووم، ببوم بە منداڵێکی زەبەلاح. واتە پیاوەکانی تەنیشتم هەریەکەو ببوون بەگورگی ژنان، منیش وەک بەلەنگازێک لەو نێوانەدا مابوومەوە. وەک خەیاڵێک مەیل و هۆگری ژنانم بەرامبەر خۆم بەبیر دێتەوە. لەوانەیە بە چاوی " بوویەرێکی بێ هیوا " سەیری منیان دەکرد. بەمانایەکی تر ئەو هەستەیان پیشاندەدام کە: کەسێکی خۆشەویستی بەڵام بەگوێرەی رۆژگار نیت. لە کاتێکدا هەرکەس هاوسەرو خۆشەویستێکی بۆ خۆی دەدۆزیەوە، لەو بارەیەوە توانای هەناسەدانیشم نەبوو. ئەشقێکی ئەوتۆم بەرامبەر خوداوەندو شتە هاوشێوەکانیشی نەبوو. تاکە مەسەلەی هۆگری ببووم بەدەستهێنانی هاوڕێی باش بوو.**

**بەر لەوەی باسی ئەو بوویەرە پووچەی هاوسەرگیری بکەم کە لەناکاو روویدا، مەیلگەلێکم هەبوو کە دەشێت بە ئەشقی پلاتۆنیکی ناوی ببەم. چەندە جوانییە ئیلاهیەکەی ژنم بۆ روون دەبوویەوە دەکەوتمە ژێر کاریگەریەکەیەوە. بەڵام ئەو هێزو داخوازیەم نەبوو بەلایەنی بەرامبەری راگەیەنم. بەردەوام نیشتیمانی لەدەستدراو کوردستان، ناسنامەی ونبووی کوردانم لەژێر ئەو ئەشقە**

پلاتۆنینەدا دەبینی. بە بڕوای من نیشتیمانی ون و ناسنامەی لەدەستدراو ئەشقێکی بەهێز، ئارەزوومەندانەو بە ئیرادەی نەدەبوو کە بەدیبێت. چەندە جێگای داخ و ئێش و ئازارە کە ئەو چەسپاندنەم ڕاست بوو.

لەو دۆخانەدا پێویستە ئازادی نیشتیمان، ڕزگاری کۆمەڵگاو نەتەوەیەک لەتاک و فاکتەرەکانی ئەشق ڕەنگبداتەوە یان نوێنەرایەتی بکرێت. تەنانەت ئەوەش پێویستی بە تێکۆشانێکی چڕی سەربازی و سیاسی هەیە، پێویستی بەهێزێکی گەورەی سیاسی و ئەخلاقی هەیە. هەروەها بێ ئەستاتیکایی و بێبەشبوون لە جوانی پەسەند ناکات. ئەوانەی بانگەشەی ئەشقی پلاتۆنییان هەیە کاتێک ئەشقەکەیان تایبەت دەکەن و خوازیارن لەدۆخی بەرجەستە ژیانداری بکەن، پێویستە تەواوی ئەو مەرجانە جێبەجێ بکەن. ئەگەر هێزەکەیان توانای جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەی نەبێت یان پێویستە درێژە بە ئەشقی پلاتۆنیکی بدەن، ئەگەر هێزەکەیان بەشی ئەوەش نەکات و مانای پێنەدەن ئەوا هاوسەرگیری شارستانی (نەریتی)و مۆدێرنیتە جێگای باس دەبێت کە ڕێسا بایۆلۆژیەکان یاخود بەیەکەوە بوونی زایەندی کۆیلانە لە ئارادیە. ئەشقی ئازاد و هاوسەرێتی بایۆلۆژی ـ کۆیلایەتی یان پەیوەندییەکانی دەرەوەی هاوسەرێتی بەیەکەوە نابن. یاسای ئەشق ئەو جۆرە پەیوەندیانە هەڵناگرێت.

ئەگەر بڵێم هەست لەژێر هاوسەرگیرییە پووچ و مەترسیدارەکەمدا نەبوو، ڕاست نابێت. ئەگەر بڵێم تەنیا بە ئامانجی سیاسی بوو دەبێتە دووڕوویی. هەست و ئامانجی سیاسی هەردووکیشیان هەبوون. نازانم ئەو بوو یاخود من بووم کە یەکەمجار لە دەرگامدا. ئەگەر بڵێم ڕێکەوت بوو، واقیعی نابێت. بە بڕوای من تاکە ڕوونکردنەوەی ئەو پەیوەندییە، وڵاتی ونبو و ناسنامەی کۆمەڵایەتی لەدەستدراو ئەشقیان سەرناگرێت. ڕووداوەکان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن. ئەو ساڵانە ساڵانێک بوون کە هەرگیز ئەشق سەرینەدەگرت. لەڕاستیدا مۆسیقاکەی ئارامیش کە ئەوکاتە گوێم لێی بوو باسی ئەو دۆخە محاڵەی دەکرد. پێویستە ئاماژە بەو خاڵەش بکەم ئەو ڕقە گەورەیەی بەرامبەر سەرنەکەوتنی ئەشق لام دروست بوو ڕۆڵی لە هەنگاونانم بۆ بونیادنانی پەکەکە و شەڕی شۆڕشگێڕی گەل هەبوو. کاتێک ژمارەیەکی زۆری کچان ـ ژنان بەشداری خەباتەکانم بوون، ئەشقێکی کۆلەکتیف (جڤاتی) لەگەڵیاندا جێگای باس بوو. هەلومەرجی ئەشقی تاکەکەسی لەئارادانەبوو. بەهیچ جۆرێک بوێری ئەشقی تاکەکەسیم پیشاننەدا کە جگە لەمن لەناو پەکەکە و دەرەوەش کەسانێکی زۆر تاقییان کردۆتەوە. دیسان کەوتبوومە ناو ترسەوە. بە مانایەکی دیکە بەردەوام بیرم لەمەحاڵبوونی ئەو جۆرە ئەشقانە دەکردەوە. ئەو بیرکردنەوەشم ڕاست بوو.

ئەوکاتە بەردەوام فیکری "بووکی کوردستان"م بە خەیاڵدا دەهات. هزری "بووکی من" هەرگیز جێگای نەبوو، سەدان کچ هەبوون کە لەمن بوێر، جوان و ژیرتر بوون. بەشێکی زۆریان شەهید بوون. بەردەوام هەوڵم دەدا پێیان بڵێم کە هی ئەوانم و لایەنگریانم. بەڵام ئەوە هەوڵێکی بێ ئاکام بوو. لە گەورە شەهیدە ژنەکان و ئەو بەها شکۆدارانە فێربووم کە ژن کەینونەیەکی هێژاو بەهادارە. ئەوەی لەگەڵیان هاتۆتە ئاراوە سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی ئازادانەی ئەشقی وڵاتی ونکراو و ناسنامە کۆمەڵایەتییە لە دەستدراوەکە بوو. لە ڕاستیدا ئەویش بە ئەشقێکی زۆر بەهادار، مەزن و ڕاستەقینە دادەنرا. ئەشقێک بوو کە خائین و دوو ڕووەکانیشی زۆربوون. بەمجۆرە منیش هەم بیرەوەری مەم و زینم زیندوو کردەوە هەم بەدیم دەهێنا.

### ا. ئەفسوناوی ژیان لە کوردستاندا لە ژن و ژیاندا بەرجەستە بوو.

ژیانی ئەفسوونی لێرە لەدایکبوو؛ لەکوردستانیش بەشێوەی ژن و ژیان (Jın ،Jıyan) فەراهەم بوو. لەگەڵ سەرهەڵدانی دەسەڵاتی پلەداری و دەوڵەت ئەو ژیانەی لەمیانەی هەزاران ساڵەوە پێکهاتبوو، دیسان لەهەمان شوێن لەدۆخی بەرجەستەی ژن و ژیان لەدەستدرا. بە بەڵگەوە سەلمێنراوەکەگشت ئەفسانەکان کۆپییەی داستانی گلگامێشن. وێنەی بەهەشت و دۆزەخیش پەیوەندی بەو ژیانەوەهەیەکەلەئارادابوون و دواتر لەدەستدراون. بەڕاستیش نەخۆشی دەسەڵات ژیان دەکوژێت. پڕۆژەی سەردەمی خۆرهەڵاتی ناوینی دیموکراتی پڕۆژەی حەقیقەتی سەرلەنوێدۆزینەوەی ژیانی ژنی ئازادەلەکۆمەڵگای ئیکۆنۆمیک و ئیکۆلۆژی لەو شوێنەی بەهۆی نەخۆشی دەسەڵات ژیانی تێدا لەدەستداوە. ەەر پڕۆژەیەک لەهەمانکاتدا یۆتۆپیای ئایندەیە. کۆمەڵگای دیموکراتیک و تازەگەری دیموکراتیک یۆتۆپیای یەکسانی و ئازادی داهاتووە کە لەناو جیاوازیەکاندا بەدیدێت.

**هەرچەندە کەمینەش بن بەڵام بەتایبەتیش لەڕابردووی نزیکدا جوگرافیای کوردستان وڵاتی گەلانی دیکەش لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەرمەنی و سووریانیەکان، بەردەوامی و پاشکۆیەکی زۆری عەرەب، فارس و تورکەکان لەو جوگرافیایەدا دەژین. تا ئێستا شوێنپەنجەی بەهێزی کولتووری عەشیرەت و قەبیلەلەکۆمەڵگای کوردەواریدا دەبینرێت، بەڵام کولتووری شار زۆر پەرەی نەسەندووە، سەرجەم ئەو تایبەتمەندێتیانە لەجوگرافیای کوردستان دەرفەتێکی مەزن بۆ پێکهاتە سیاسییە دیموکراتییەکان دەرەخسێنێت. ئاواکردنی یەکینەی کۆمیناڵ لەبوارەکانی کشتوکاڵ ـ ئاو ـ وزە هەم نموونەییە هەم ناچارییە. هەلومەرجەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقیش تادوایی لەبارە، هەروەها جوگرافیایەکە بۆ یەکەمین جار و بەشێوەیەکی بەهێز کولتووری مێخوداوەندی تێدا ژیاوە. زمینەی سەرەکی کولتووری مێخوداوەندی . دایک کە بە ناوەکانی ستار، عەشتار و ئینانا لەخۆرهەڵاتی ناوین و جیهان بڵاوبۆتەوە. سەرباری سەرجەم هەوڵەکانی لەپێناو لەناوبردنی بەرێوەبراو، بەڵام تائێستاش ژن خاوەن ئەو پۆتانسیێلەیە کە نموونەی ژیانی بوێری، بەرخودان و سەرفرازی پیشانبدات. سەرەڕای هەوڵ و کۆششێکی زۆر، بەڵام ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگای رەگەزگەرایی وەک کۆمەڵگا دراوسێکان بەدامەزراوەنەبووە. ئەو تایبەتمەندێتیە کولتوورییەدەوڵەمەندانەی لەناو یەکتر و بەیەکەوەدەژین لەبونیادنانی کۆمەڵگای دیموکراتیکدا پۆتانسیێلێکی شکۆدار و مەزن لەخۆوەدەگرێت کەئازادی و یەکسانی (لەناوجیاوازیەکەیدا) ژن پێوانەی سەرەکیەتی. لەم سۆنگەیەوەلەژێر پارادایمی تازەگەری دیموکراتییەوە ئەو جوگرافیایە گونجاوترین هەلومەرج بۆ نەتەوەی دیموکراتیک و کۆمەڵگای ئیکۆلۆژی ـ ئیکۆنۆمیک دەرەخسێنێت. هەر لەئێستاوە پرۆژەی کۆنفیدراسیۆنی دیموکراتیانەی کوردستان دەرفەتی جێبەجێکردنی هەیە.**

**ئەگەر لەبەندیخانە بێت یان دەرەوە، لەناو سکی دایکدا بێت یان لەهەر سات و شوێنێکی فەزا تەنیا بەسیفەتی کۆمەڵایەتیەوە دەشێت ژیانی مرۆڤ لەناو ئازادی، یەکسانی ( لەناو جیاوازیەکاندا ) و دیموکراسیدا بێت. شێوەکانی دیکەی ژیانی دەرەوەی ئەوە لادانن، لەو سۆنگەوە نەخۆشی و دەردەدارییە. بەئامانجی راستکردنەوەی و گەیاندنی بە دۆخێکی تەندروستانە شۆڕشیشی لەناودا لەمیانەی گوتەو کرداری کۆمەڵایەتی جیاوازەوە تێکۆشان بەرێوەدەبرێت. لەوپێناوەشدا زهنیەت و ئیرادەیەکی ئەتیک، ئەستاتیک، فەلسەفی و زانستیانە دەئافرێنرێت. کچان تا تا دەهات زانابوونیان کەڵەکە دەبوو و، ناچار دەبوون کە چارەسەری ریشەیی کێشەکانی ئازادیان بکەن.**

**بۆیەکەمین جار لە ئاداری ۱۹۸۷ شیکردنەوەکانم سەبارەت بە بابەتی ژن دەستی پێکرد. تامۆخی ئێسقان هەستم بەو بەڵایە کردبوو کە لە رێگای ژنەوە بەسەر من و بزووتنەوەکەماندا کەڵەکە ببوو. بۆ یەکەمین جار بوو هەوڵمدا لەمیانەی رێبازێکی نوێوە، واتە لە رێگای شیکارەکانەوە وەڵامی ئەو هەڵوێست و رەفتارانە بدەمەوە کە هەڤاڵە هێژاکانمی شێت کردبوو. هەروەها بە کوشتن سزادانی هەندێک لە ژنان لە سەرووی هەمووشیانەوە عائیشە ئاقارسووی خەڵکی پازارجک، سایمە ئاشکن ی خەڵکی دێرسیم و ئایتانی خەڵکی نووسەیبین و پەسەندکردنی ئەو سزایانەش رۆڵیان لەو هەنگاوەم هەبوو. کێشەی ژن کێشەیەک بوو بەپێی کات جدیتر دەبوو. لەسەرەتای هەر خولێکی پەروەردە شیکارەکانم لەو بارەیەوە هەنگاوێک بەرەو پێشتردەچوو و قووڵترم دەکردەوە. زیادبوونی ژمارەی کچە لاوەکان لە ریزەکانی بزووتنەوەکەمان دۆزینەوەی رێگە چارەیەکی ریشەیی بۆ کێشەی ئازادی ژن دەبوو بە ناچارییەک، بەڵام بەلا بێ ئامانەکەی سەرم کەسیرە رۆڵی سەرەکی لەو خەباتە هەبوو. کوشتنی راست نەبوو، بەڵام بۆ کاتژمێرێکیش دەرفەتی بەیەکەوە ژیانی نەهێشتبوو، ئاستەم و مەحاڵی کردبوو. بۆخۆی کەسێکی ژیربوو. هەربۆیەش ئەو گوتانەی لەکاتی شەهیدبوونی هەڤاڵ مەعسوم گوتبووی پیشانیدەدات کە کەسێکی چەندە ژیربووە و چۆن بەشێوەیەکی راست بەدواداچوونی بۆ رێکخستن کردووە، بەڵێ گوتبوی "ئەو کەسەی زۆرترین متمانەت پێی هەبوو مەعسوم قورقماز یش نەما. ئێستا چی دەکەیت؟" وەک بڵێی چاوەڕوان بوو پاشەکشێ بکەمو رادەستی ببم. بەو ئێش و رقە گەورەیەی ئەو جۆرە هەڵوێستانە ئافراندیان هەڵمەتی ۱۹۸۷م دەست پێکرد. بەگوێرەی رێگە و رێبازی باو دەمانتوانی لە رێگای کوشتن یاخود تەڵاقدان مەسەلەکە چارەسەربکەین. بەڵام هەڵوێستێکی بەمجۆرە بۆ من مانای شکستی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بوو. هەروەها رادەستکردنی رێکخستن بەو یاخود دابەشکردن لەگەڵیدا دیسان بەرەو هەمان ئەنجام دەچوو. ئەگەر کەسێکی پاکیش بوو بێت بەڵام هیچ رەنجێکی نەبوو. تەنیا بەشێوەیەکی شارەزایانە چاودێریو پێشبینی دەکرد، بەشێوەیەکی نەرێنی رۆڵی لە هەڵمەتە تەکتیکیەکاندا دەبینی. لە کەسایەتی ئەودا**

دەمویست هەر شتێک شیکار بکەم کە پەیوەندی بە ژنەوە هەیە. هەروەها دەمویست وەڵامێکی ریشەیی ئازادیخوازیی و یەکسانیخوازی بدەمەوە پەیوەندیەکانی نێوان ژن ـ پیاو کە تا دەچوو زیاتر خۆی دەسەپاند.

بەشداری پێکردنی ژنان لە خەباتێکی وەک رێکخستنی سەربازی کە سەداسەد مۆرکی ئایدیۆلۆژیای پیاوسالاری و پیاوانی پێوەیە زۆر مەترسیداربوو؛ وەک ئەوەبوو دینامێت بخەیتە ناو کارو خەباتەوە. چەمکە باوەکانی پیاوان و ژنان کە لە ئارادابوون، لە چەمکی باوو قەبەی رەگەزپەرستی زیاتر بڕی نەدەکرد. جگە لە وروژاندنی یەکتری و ئیشارەتەکانی چاونوقاندن و برۆ هەڵتەکاندن بەولاوە خاوەن چەمکێک نەبوون. بەدەستەکانم بەلایەکی گەورەم بۆخۆم دروست کردبوو. بگرە فەرماندەیەکی گەریلایی بەناوبانگی وەک گیڤاراش کاتێک ژنان بەشداری ریزەکانیان دەکەن تێرکردنی زایەندی رەت نەکردۆتەوە، وەک پێویستیەکی ناچاری پەسەندی کردووە. پەسەندکردنی شتێکی بەمجۆرە لەلای من، سەپاندنی بەسەرخۆم و کارو خەباتی رێکخستنی، بەتایبەتیش کارو خەباتی سەربازی، هەرلەسەرەتاوە مانای لەناوبردنی خۆمان بوو. هێشتنەوەی ژن لە دۆخی خۆیدا، بەتەنیا بۆ لەناوچوونمان بەس بوو. هەڤاڵێک یاخود گروپێک لە ئارادانەبوو کە بەسەر رەمەکی زایەندیدا زاڵ بێت، بەشێوەیەکی راستو لەسەر بنەمای بەرژەوەندیەکانی رێکخستن و هونەری سیاسەت تاوتوێی بکات. بەتەواوی بەدەرنانی ژن، ئەنجامدانی شۆڕشێکی بێ ژن بۆ من و رێکخستن یش راست نەبوو. رێگەیەکی دیکەی چارەسەری هەبوو: بە گوتەی عامیانە ئەویش "بەستنەوە" بوو، هەروەها "هاوسەرگیری شۆڕشگێڕیش" رێگەچارەیەک بوو کە رێکخراوە چەپڕەوە شۆڕشگێڕیەکان کردبویان بەمۆدێلێک. بەڵام ئەو رێبازانەم بەراست نەدەزانی. جگە لە مایە پووچکردنی وزەی شۆڕشگێڕی، هەلومەرجە ماددی و جەستەییەکانیش دەرفەتی بەو جۆرە بەستنەوە و هاوسەرگیریە شۆڕشگێڕیانە نەدەدا. ئەوە جگە لە گرتنە بەری رێگای پەنابەری ئەوروپا یاخود تێکەڵبوون بە خەڵک و ژیانێکی پارازیتی بەناوی رێکخستن هیچ ئەنجامێکی دیکەی لەگەڵ خۆی نەدەهێنا. ئەوەش شێوەیەکی دیکەی تەسفیەکاری بوو.

ئەو رێگایەی تاقیم کردەوە، بڕیاردان بوو لەسەر شێوازێکی پەیوەندی کە لە کولتووری خۆرهەڵاتی ناوین بیری لێنەکراوەتەوە و بە خەیاڵیشدا نەهاتووە؛ ئەویش رەچاوکردنی ژیان و شەڕکردنێکی تا دوایی بوو لەناو پەیوەندی و ناکۆکیەکی دیالیکتیکی دەرەوەی هاوسەرگیری کە بە پێویستیەکی ناچاری دادەنرێت. بەم جۆرەش دەمویست پیاو و بەتایبەتیش ژن ئاشنای بوونی راستەقینەی مرۆیی و ئازادیەکەی خۆی بکەین. ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی گەورەی شۆڕشگێڕی ناوخۆیی بوو. قۆستراپەوە، خراپ بەکارهێنراو بوو بە ئامرازی سەدان تەڵەکەو فریودان. بەڵام دیسانیش هەر ئەو کار و خەباتە ژنانی ئازا و بەگەوهەر، ئاقڵ و شۆخی ئافراند. چەندین کچانی شۆخو ژیرمان لێ شەهید بوو. لەپێناو وەڵامدانەوەی تامەزرۆیی و حەسرەتەکانیان رۆژانە سەرلەنوێ خۆمم دەئافراندەوە. بەڵام بەهۆی وەڵامنەدانەوەیەکی تەواو بەردەوام لەناو ئێشو ئازاردا ژیام. بەیەکگەیشتنێکی مێژوویی و ئازادانەم لەگەڵ ژن ئەنجامدابوو. بەڵام بەهیچ جۆرێک نەمدەتوانی وەک شیرین و فەرهادی هاوچەرخ بەیەکتر بگەین. بەڵام لەو بڕوایەدام کە فەراهەمکردنی ساتێکی حەسرەتی بەمجۆرە مانادار و پێویست یش نییە. زۆرباش ئاگادار بووم کە بە یەکگەیشتن لەو هەلومەرجەدا (لە سیستەمە هەژموونگەراکاندا) مردنی ئەشقە. لەو سۆنگەوە ئەوەی گرنگ بوو بە ئەشقەوە کارکردن بوو لە پێناو چارەسەرکردنی گشت کێشە کۆمەڵایەتیەکان. بەمانایەکی تر ئەخلاقی راستەقینەی ئەشق مانای پیشاندانی هێزی شەڕکردن لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتیەکان و بەهرەی چارەسەرکردنیان بوو. ئەوانەی خاوەنی ئەو هێزو بەهرەیە نەبوون، یان ئەو هێز و بەهرەیان لەخۆیاندا پێشنەخست نەدەبوون بە خاوەنی ئەشق و ئەخلاقی ئەشق.

دەبێت دانی پێدا بنێم کە منیش لە قۆناخێکدا تووشی نەخۆشی مۆدێرنیتە هاتم، بە دایک و باوکیشمەوە، دەمویست لە هەموو شتێک رابکەم. بەردەوام لەبەرامبەر خۆمدا دانی پێدا دەنێم کە ئەمە لە ژیاندا گەورەترین بە هەڵەداچوونی من بووە. بەڵام باش دەزانم کە لە تێبینییەکەی برادوای دانەبڕام؛ وەک رۆڵەیەکی ئەم بنارانە، لووتکەی شاخەکانم وەک تەختی خوداوەندەکان بینی، بنارەکانیشم وەکو پارچەکانی بەهەشت بینی کە (خوداوەندەکان) خوڵقاندویانە: بەردەوام خوازیاری سوڕانەوە و گەڕانیم دەکرد. کاتێک هێشتا منداڵ بووم ناوم وەکو "شەیدای چیا" دەرکردبوو. دواتر زانیم کە ئەم ژیانە زیاتر تایبەت بە خوداوەند دیۆنیسۆس بووە. کاتێک دەگەڕێت گروپێکی کچانی ئازاد و هونەرمەند بەناوی "بەخـا " لەگەڵیدان. بە یەکەوە دەیان خوارد، دەیان

**خواردەوە و کاتیان بەسەر دەبرد. ئەم ژیانە ئیلاهییەم خۆشویستبوو. نیچەی فەیلەسوفیش لە جیاتی زیۆس ئەم خوداوەندەی هەڵبژاردبوو. تەنانەت ناونیشانی "شاگردەکەی دیۆنیسیس"ی لەژێر چەندین کورتە گوتارەکانی خۆیدا نووسیوە. کاتێک لە گوند بووم، هەرچەندە بە گوێرەی پێویستییەکانی ئایینیش نەبێت، لە گەمەکانی چاوشارکێ و خوازبێنی کچان زیاتر، حەزم دەکرد بە یەکەوە لەگەڵ کچان یاری بکەم. بە گوێرەی من سروشتییەکەشی دەبێت بەم جۆرە بێت. هەرگیز بە سنگ فراوانییەوە تەماشای داپۆشینی ژنانم نەکرد کە لە لایەن کولتووری دەسەڵاتدارەوە دەکرێت. ئەو یاسایەم نەناسی کە نامووسی پێدەڵێن. تا ئێستاش بۆ گفتوگۆی ئازادانەی بێ سنوور، یاری کردن و هاوبەشێتی کردنی تەواوی پیرۆزییەکانی ژیان لەگەڵ ژن دەڵێم "بەڵێ"هەم، بەڵام بۆ ئەو پەیوەندییانەی لەسەر بنەمای هێزە و بۆنی موڵکایەتی لێدێت، چی ناوێکی لێبنرێت و لەژێر هەر بیانوویەکیش بێت، بەم پەیوەندییە دەڵێم نەخێـر.**

**لەم شاخانە بەردەوام بە ئیلهامی خوداوەندە ژن سڵاوم ئاراستەی گروپی ژنە ئازادەکان دەکرد، هەوڵمدا بەم جۆرە واتاداریان بکەم. بەردەوام کاتێک رستەی " لۆری یان تراکتۆرێکی پڕ لە ژنانی باشووری رۆژئاوا (باکووری کوردستان) کە بە ئامانجی کارکەری وەرزی دەچوونە ئەنادۆڵ لە فڵان شوێن لە ئاکامی رووداوی هاتووچۆ مردن" لە هەواڵەکاندا بەر گوێم دەکەوێت ئەو رق و نەفرەتەی لام، دژی بەناو خانەوادەکانی ژنان (پیاو، خێزان، پلەداری، دەوڵەت) دروست دەبێت، دەتوانم بڵێم سەبارەت بە هیچ رووداوێکی دیکە لام دروست نەبووە. چۆن دەبێت رەچەڵەکی خوداوەندە ژن تا ئەم رادەیە دووچاری رووخان هاتبێت؟ هەرگیز ئەقڵ و رۆحم ئەم رووخانەی پەسەند نەکردووە، لەبەرئەوەی هەرگیز دەرخواردی زهنیشم نەدا. بە گوێرەی من ژن یان لە پیرۆزی خوداوەندیدا دەبێت یاخود هیچ نابێت. بەردەوام بیرم لە راستی و ناڕاستی ئەم گوتەیە کردۆتەوە " ئاستی ژیانی ژنانی کۆمەڵگایەک، پێودانگی سەرەکی ئاسینی ئەو کۆمەڵگایەیە". گوتەی "پاشماوەی کولتووری خوداوەندە دایکی نیولیتیک"م بۆ دایکم بەکارهێنابوو. وەکو ئەوان قەڵەو بوو. بونیادی ساختەی مۆدێرنیتە سەبارەت بە دایک، نەیدەهێشت پیرۆزییەکەی دایکم ببینم. سەرباری ئەوەی ئازاری زۆر گەورەم لە ژیانمدا چەشتووە، بەڵام لە هیچ رووداوێکدا بە جددی نەگریاوم. بەڵام دوای ئەوەی قاڵبەکانی مۆدێرنیتەم رووخاند، کاتێک دایکم، یان لە کەسایەتی ئەودا تەواوی دایکانی رۆژهەڵاتی ناوینم بە بیر دێتەوە دڵپەست دەبم و چاوەکانم پڕ لە فرمێسک دەبێت. بژاردەترین و خەمگینترین یادەوەرییەکانم: واتای ئەو ئاوەیە کە دایکم بە زەحمەتییەکی زۆرەوە بە سەتڵ لەسەر بیر دەیهێنایەوە، لە نیوەی رێگادا بۆ منی دادەنا سەر زەوی و قومم لێدەدا و دەمخواردەوە. پێشنیازی من بۆ هەر کەسێک ئەوەیە دوای نەهێشتنی قاڵبەکانی مۆدێرنیتە، سەرلەنوێ تەماشای پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دایک و باوکیان بکەنەوە. خوازیارم بە هەمان روانگە تەماشای تەواوی "پەیوەندییەکانی گوند"یش بکەن، کە لە نیولیتیکەوە ماونەتەوە. گەورەترین سەرکەوتنی مۆدێرنیتە لەوەدایە: تێڕوانینی کولتووریمانی رووخاندووە کە لە میانەی پانزدە هەزار ساڵ ئاوا کراوە و کردوویەتی بە هیچ. ئاشکرایە کە تێڕوانینێکی ئازاد و رەسەنانە، خولیای بەرخودان و ژیان لەو تاک و جڤاتانە چاوەڕوان ناکرێت کە تا ئەو رادەیە رووخێنراون و کراون بە هیچ.**

**رووداوی دووەم، تامەزرۆیی ئافرەت بوو کە لەو ساڵانە سەریهەڵدایەوە. بەر لە گروپ ئەو هێزەم نەبوو لە هەلومەرجی مۆدێرنیتە نزیکی ئافرەتێک ببمەوە. یەکێک لەو دونیایانەی ئاشنای نەبووم و خۆمم لێی بەدوور دەگرت دونیای ژنان بوو. تەنیا لە ناخمدا خاوەن هەست و سۆزێکی پلاتۆنی بووم. هەرگیز نەدەبوو لە بەرامبەر یەکێکیاندا دان بەو هەست و سۆزانەم دابنێم. لە سەردەمی گوندەوە نیگای ژنان بەرامبەرم سەرنجڕاکێش بوو. بەڵام من لە ماناکەی تێنەدەگەیشتم. دواتر کاتێک شرۆڤەم کرد، لەو بڕوایەدام کە دەرکم بە جیاوازیەکەی یان هۆکارەکەی سەرنجڕاکێشی کردووە. ئەوان بە بایەخەوە هەستیان بە جیاوازیەکانم کردبوو. لەوانەیە تۆزقاڵێک هیوایان لەمندا دەبینی. وەک بڵێی پێم دەڵێن:"ئەی رۆڵە تۆ نازانیت دووچاری چی هاتووین. رەوشمان زۆر جیاوازترە لەوەی دەبینرێت. ئەگەر بەسەرهاتەکانمان بزانیت! هەرچەندە پیاویش بیت، بەڵام دیسان جێگای هیوامانی". هەستم بە جوانیەکەی ژن دەکرد. لە بیرمە کاتێک لە ناخمدا داوەریەک پێشکەوت و بە کچەشۆخێکی کورد بڵێم "تۆ، رەچەڵەک و قەومەکەت شایەنی ئەوەن شەڕی سەربەخۆییتان لە پێناو بەرپا بکرێت".**

لەبەر ئەوەی هاوشاری هەڤاڵ مەزڵووم دۆغان بوو لە قۆناخی گروپ کەسێکمان بەناوی کەسیرە یلدرم ناسی. بەهۆی مەیلەکەی بۆ گروپ ئەویشمان بە ئەندامێکی گروپ دانا. هیچ شتێکم لە بارەی ژیانی رابردوویەوە نەدەزانی. بەڵام بەهۆی بیرکردنەوەم لەو رۆڵە نائاساییەی (تێکدانی رێک و پێکی گروپ) لەوانەیە بەشێوەیەکی بابەتی بیبینێت، هەر لە سەرەتاوە ئەندێشە و نیگەرانیم هەبوو. ئەو هێزەم نەبوو بتوانم کۆنترۆڵی بکەم. لە پێناو سەلامەتی گروپەکەمان، پێویستی پێشنیارکردنم بینی تا پەیمان لەگەڵ هەریەکێکیان ببەستێت . هەرچەندە ئەمە شوێنپەنجەی نەریتی و محافەزەکاریش لە خۆوە بگرێت .. دەیتوانی لەگەڵ من یان هەریەکێک لە ئەندامانی گروپ پەیمان ببەستێت. لە راستیدا چاوەڕوان بووم من هەڵبژێرێت. ئەو ژنە خاوەن کەسایەتیەکی هاوشێوەی گورگ بوو. لە راستیەکە تێگەیشتبوو، واتە دەیزانی لەو رێگایەوە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەدەم. یەکێکی تری هەڵبژارد. غروری نەریتی منی شکاندبوو، بەڵام بێدەنگ بووم. نارەزایی دەربڕینم شایەنی سەرفرازی کەسێتی خۆم نەبینی. دیسان بە دوعایەکمان گوت ئامین کە سەری نەدەگرت. پەیوەندیەکەی بەردەوام نەبوو، راستیەکەی نەیتوانی درێژەی پێ بدات. کاتێک دووبارە پەیوەندیم لەگەڵ بەست هەم خۆم زۆر شپرزەببووم، هەم ئەندامێکی زۆر بە نرخی گروپەکەمان لە داستدابوو.

دۆخە سۆزداریەکەم ئیتر ببوو بە کێشەیەکی جددی. بەڵام لە راستیدا بە بایەخەوە هەوڵمدا کە کێشەکانم لای گروپ، پارتی و HRK رەنگنەداتەوە. ئەو تەنگژەی لە کۆتاییەکانی ۱۹٦۰کان سەبارەت بە خوداوەند دووچاری هاتم لە دەوروبەری ئەو ژنەدا دووبارە بوویەوە؛ بە جۆرێک لە جۆرەکان جێی ئەوی گرتەوە. هۆکارەکانی نزیکبوونەوەی ئەو ژنە لە گروپەکەمان نازانم. لەو بڕوایەدانیم مەیلێکی زایەندی هەبوویێت. مسۆگەر لە بواری مەیلی زایەندی یان سێکسیەوە یەکێکی زاڵ بوو. لەو لایەنەوە بە هەڵەداچووبووم. سەرەڕای نەبوونی ئەو هێزەی بە دەستی بێنم بەڵام دیسان پێداگریم کرد. پەیوەندیەکەم تا ئاستی هاوسەرگیریەکی رووکەشی و یەکلایەنە برد. لە هاوینی ۱۹۷۸ بە کارتی هاوسەرگیریەوە بۆ یەکەمجار بە فڕۆکە لە دیاربەکر دابەزیم. لەوانەیە لە مێژووی پەیوەندی نێوان مرۆڤدا کەسێک بووم کە سەیرترینو خێراترین مانگی هەنگوین بەسەرببەم. کاتێک ژنە بوو بە قاڵبێک سەهۆڵ، هیچ چانسێکی چارەسەریم نەبوو. لە دۆخێکدا نەبووم دەردی خۆم بۆ یەکێک باس بکەم. چونکە من خۆم تاکە بەرپرسیار بووم. لەو پەیوەندیەدا ژنە بەرپرسیار نەبوو. ئیتر چیم چاندبوو ئەوەم دەدوریەوە. لە راستیدا هیچ زانیاری و چاوەڕوانیەکم نەبوو کە ناسنامەیەکی بەمجۆرەی هەبێت. بە گشت خەسڵەتەکانی گورگەوە ژنە لە بەرامبەرم بوو. لەو بڕوایەدام کە سەبر و ئارامیەکی بەمجۆرە لە نێوان دوو مرۆڤدا بوونی نییە کە من بەدرێژایی دە ساڵ تا هاوینی ۱۹۸۷ پیشانمدا ئەو کاتەی بە ئیرادەی خودی خۆی لە بزووتنەوەکەمان دابڕاوە. ئەزموونێکی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەر بوو.

بە ساغی دەرکەوتن لەو پەیوەندییە پێویستە وەک پەرجوو یان موعجیزەیەک ببینرێت. زەحمەتیەکە سەرچاوەی خۆی لەوە دەگرێت کە توانیم کەسایەتی خۆم بەرامبەر ئەو گۆڕانکاریانە لەسەر پێیان بهێڵمەوە کە لە کولتووری خۆرهەڵاتی ناویندا ستاتۆی ژن سەراوبن دەکات. شەڕ و تەڵاقدان نەدەبوو بە چارەسەری. لەبەر ئەو هۆکارە بوو کە رەوشی خۆم بەرامبەر بەو کەسە بەو تەنگژە چواند کە بەهۆی گومانەکانم سەبارەت بە بوون و نەبوونی خوداوەند دووچاری هاتم. لە بواری ئایدیۆلۆژی و سیاسیەوە دەبوایە ئەو پەیوەندییە شیکار بکەم. هەروەها ئەگەر پەرەم بە شیکارەکانی دەرهەق بەژن نەدابوایە، ئەوا چارەسەری ئایدیۆلۆژی و سیاسیش تەواو نەدەبوو. لەو قۆناخەدا هێشتا هێزی شیکارکردنم لە بارەی ژنەوە پێشنەکەوتبوو. تەنیا لە ۱۹۸۷ بەدواوە توانیم پەرەی پێبدەم. بەڵام وەک چۆن لەمیانەی رەشنووسی بەرنامە وەڵامی شەهید بوونی هەڤاڵ حەقی قەرارم دایەوە، ئەوا وەڵامەکەم بەرامبەر ئەو شەڕە سایکۆلۆژیەش نووسینی رێگای شۆڕشی کوردستان بوو. ئەو بەرهەمەی هاوینی ۱۹۷۸م وەک بناخەی تیۆری بەرنامە ئامادە کرد. لە هەلومەرجێکی سایکۆلۆژی بەمجۆرەدا نووسینی مانیفستۆی شۆڕشی کوردستان پێویستی بە بەهرەو هێزێکی مەزن هەیە. کاتێک باسی پەرجووم کرد مەبەستم ئەو واقیعە بوو.

مەرجی پێویستی فەراهەمبوونی ئەشق لە فەلسەفەی هیگلدا بەدیهاتنی هاوسەنگی هێزە. ئەو مەرجە پێویستە بەڵام ناتەواوەو گوزارشت لە ژنی بەهێز دەکات. باس لە هاوسەنگی هێزی ماددی و قەبە ناکرێت. ئەوەی باس دەکرێت هاوسەنگی هێزی جەستەیی، سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتییە. واتە ئەو ژنەی لەناو کۆنترینو قووڵترین کۆیلایەتیدا دەژیت ناشێت خاوەن ئەشق بێت. لەپێناو پڕکردنی ناوەڕۆکی ئەو بۆچوونە فەلسەفیەی لایەنی راست لەخۆوە دەگرێت بەشێوەیەکی هەمەلایەنە ئەولەویەتمدا بە

**بەهێزکردنی ئەو ژنانەی لە ریزەکانماندا بوون. لە چوارچێوەی تێگەیشتنی ئەو راستیەی کە رێگای رێزگرتن بەرامبەر ژنان، خۆشەویستی و هەڵوێستی بە پرەنسیپانە، راستی و جوانی بە بەهێزکردنی ژناندا دەرباز دەبێت پەیوەندیم بەرامبەر ژن پیشاندا. لەو سۆنگەوە ژن بەهێز نەبێت ئەشقەکەشی جێگای باس نەدەبوو. مسۆگەر باوەڕی تەواوم بەراستی ئەو پێناسەیە هەبوو. دڵنیابووم کە بابەتێکە نابێت سازشکاری لە بارەوە بکرێت. دوای بەدەستهێنانی ئەو هێزو بەهرەیە ئیتر کارو خەباتەکانم سەبارەت بە ژن هێژاو بەهادار دەبوو. کچان بەجۆرێک سەیریان دەکردو یەکتریان لە باوەش دەگرت وەک بڵێی لەخەوو دێوەزمەیەکی هەزاران ساڵی بێدار بوونەتەوە. بگرە سەرباری ئەوەی سەبارەت بەو بابەتە زۆر بە تەگبیرم، بەڵام خۆشم هیچ دوودڵیەکم لەوەدا نەکرد کە بیانکەم بە تاجی سەرمو لە باوەشیان بگرم. لەو بارەیەوە دووچەمکی هەڵە بەردەوام خۆیان سەپاند: ئەوانەی لەژێر ناوی موڵکایەتی وابەستە بە زایەندگەرایی فەبەو بێ هیچ بنەمایەکی ئایدیۆلۆژی، سیاسیو کرداری کاتێک دەرفەتیان دەبینی رەفتاری هەرزانو سووکیان دەنواند زۆر وێرانکەر بوون. لە بەرامبەر ئەوەشدا سۆفیگەرایی فەبە، واتە بەلاوەنانی کاریگەری زایەندی لەمیانەی سەرکوتکردنو فشار لەخۆکردن جگە لە گەورەکردنی کێشەکە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەدەکەوتەوە. ئەو کاروخەباتانەی لە چوارچێوەی رێڕەوی یەکسانی و ئازادی دیموکراسیخوازانە پێشخران بوو بە پێوەرە تۆکمەکەی ئازادی کۆمەڵایەتی. پەرەسەندنە پراکتیکیەکان راستی، چاکی و جوانی هەڵوێستی بە پرەنسیپانەی سەلماند.**

**بە ساردی نزیکی ئەو پەیوەندیانە دەبوومەوە کە فەرمی بوونو بۆنی دەسەڵاتیان لێدەهات. وەک ئەلتەرناتیفێکی دوورخستنەوەی من لەگەڵ دەهاتە بەرچاوم. پیشاننەدانی گەرمی پێویست بەرامبەر ئەو کەسایەتی و گروپە دۆستە جیاوازانەی دەهاتنە لامان وابزانم ئەنجامێکی دەسەڵاتداربوون بوو. وەک بڵێی لە نێوان گەلو دەسەڵاتدا هاتووچۆم بوو. قووڵبوونەوە سەبارەت بە دوالیزمی دەسەڵات و دیموکراسی شتگەلێکی زۆر قەرزباری ئەو پەیوەندیانەیە.**

**ژنانم وەک گروپێکی یان پۆلێنێکی جیاوازی گەل شیکارکرد. هەرچەندە هەلومەرجەکان زۆر لەباریش نەبووبن، بەڵام شوێن دۆزینەوە بۆ ژنان بابەتێک بوو کە بەردەوام رەچاوم کردووە. دوودڵیم نەکرد بەرپرسیارێتی ئەو ماڵانەیان پێ بدەم کە تێیدا دەمانەوە. هەندێک لە ساختەکارەکان چونکە بە شێوەیەکی راست ناسنامەی ژنیان شیکارنەکردو لە خۆیاندا چارەسەریان نەکردبوو بەشێوەیەکی چەوت ئەو هەڵوێستو کارو خەباتەیان هەڵدەسەنگاند. کاتێک باسی ژنان و کچان کراوە بەردەوام زایەندی فەبەو پەیوەندی هەرزانیان بەبیردا دەهات. کەچی من لە کاروخەباتی سەبارەت بە ژن زیاتر دەرکم بە راستی و حەقیقەتی کۆمەڵایەتی و مێژوویی دەکرد. لەلای منەوە ئەوان ناوەڕۆکی سۆسیۆلۆژیا بوون. ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت شکاندنی سیستەمی پلەداری بونیادنراوی سەر ژنان لە مەیدانی خەباتی خۆمدا لەسەدان پەرتووک زیاتر وانە بەخشتربوو. پلاتفۆرمی پەیوەندیەکانی لەگەڵ ژنان پێشمەدەخستن ستاتۆی ژنایەتی ـ مێردایەتی پیاوسالاری پارچەپارچە دەکرد. لە راستیدا زۆرترین بەختەوەریم لە پارچەکردنی ئەو ستاتۆیەدا بوو. چەندە زیاتر روون دەبوویەوە کە ئۆبژەیەکی زایەندی نین بەڵکو مرۆڤێکی زۆر هێژاو بەهادارن زیاتر سەرفیراز دەبووین. ئەو هەڵوێستە ئەو رێگایەشی دەکردەوە کە بەرەو خۆشەویستیەکی رەسەن دەچێت. خاوەن هێزێکی بێ هاوتای دونیای خۆشەویستی و رێزبوو کە لە ناخی راستی کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە بونیادنراوە بەبێ ئەوەی هیچ فشارێک ببینێت. هەرچەندە هەندێک نمونە لەناویان دەرکەوێت کە ژنێتی نەفس نزمو ئاڵودەیان دەرباز نەکردووەو هەوڵدەدەن بە درۆو دەلەسەکانیان لە کەداریان بکەن، بەڵام ژمارەیەکی زۆری ژنی بەهادارو رەسەنیش سەریانهەڵداوە. ئەوانیش زۆربەیان شەهید بوون. بە قارەمانە بێناوەکان ناویان نابەم بەڵکو بە قارەمانە راستەقینەکان ناویان دەبەم. ئەگەر ژیانێکی کۆمەڵایەتی بێتە ئاراوە کە دەرفەتی ژیانی تێدا هەبێت، ئەوا تەنیا لەمیانەی پابەندبوون بە یادەوەرییە نەمرەکانیان و بەردەوامکردنی ئەو رێگایە فەراهەم دەبێت کە رۆشنیان کردۆتەوە. تەنیا ژیانێکی شکۆمەندانەی بەم جۆرە لەگەڵ ژندا بەهادارو هێژاترین ژیانە. جۆرەکانی دیکەی ژیان ئەگەر لەناو کۆشکی رازاوەو سەر نوێنی لۆکەیی و پەرەمووچکەش بەسەر ببرێت، بەبڕوای من هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەو ژیانە نییە کە لەناو چاڵدا پەلەقاژەیەتی. بەکورتی بەو ئەنجامە گەیشتم: راستی، چاکە و جوانی ئیلاهی ژن بدۆزەوە و لە گەڵیدا بژی! ئەگەر تۆزێکیش بێت بە شێوەیەکی بەرامبەر پشکی خۆمان لەو ژیانە وەرگرت، هاوبەشێتی ئەو ژیانەمان کرد و تێیدا ژیاین. کاتێک دەڵێیم ژیاین، مەبەستم ئاماژەکردن بەو راستیەیە کە فەلسەفەی ژیانی ئازاد تەنیا لەمیانەی ئەو هاوبەشێتی و پشکداریکردنە مانادار دەبێت و پێناسە دەکرێت.**

**بۆ یەکەمین جار گوێم لە دەنگی ئارام تیگران بوو کاریگەریەکی جیاوازی لەسەرم هەبوو. زۆر دواتر کاتێک راڤەم کرد بەو ئەنجامە گەیشتم هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە دەنگێکی زۆر نزیک بە درکاندنی راستی کورد، بەتایبەتیش راستی گەلی کوردو حەقیقەتەکەی. هەربۆیەش لام پەسەند بوو کە هونەر شێوەیەکی دیکەی روونکردنەوەی حەقیقەتە: هەم بانگەوازیەک بۆ راستی گەلی کورد لەناواخنی ئەو دەنگە لە ئارادابوو، هەم ئاماژەی بە " ئەشقی نائومێد " دەکرد. لەو سۆنگەوە زۆر لەگەڵ ئەو واقیعە رێک بوو کە تێیدا دەژیام. لە کاتێکدا لەلایکەوە لەمیانەی لێگەڕینە ئایدیۆلۆژیەکانەوە هەوڵی روونکردنەوەی کێشەی کوردم دەدا، لەلایەکی دیکەشەوە تەواوکردن و بەهێزکردنی لەرێگای مۆسیقاوە مایەی تێگەیشتن بوو. چیتر مۆسیقا و لێگەڕینی ئایدیۆلۆژی سەبارەت بەکێشەی کورد دەستی یەکتریان گرتبوو.**

**هۆگریم بەرامبەر ژن لەو ساڵانە و بەهەمان شێوە سەریهەڵدا. بەشێوەیەکی سروشتی وابەستەبوونی کوێرانەی هەرگەنجێک لەو یەکەمین ساڵانەی دووچاری دێن لەوانەیە بۆ منیش جێگای باس بوایە. تا بڵێی لە هەڵوێستی بایۆلۆژی و نەریتی دەرهەق بەژن دوورکەوتبوومەوە. مەیل و خولیایەکی بەمجۆرەشم بێدار نەببوویەوە. ئەو ژنەی لە هەلومەرجەکانی شار خۆی نمایش دەکرد رووخسارێکی مۆدێرنی هەبوو. سەرنجی رادەکێشام، بەڵام نزیکبوونەوەم لە کچێک کە وەک پێویستیەکی مۆدێرنیتەی تورک پێگەیشتووە، ئەگەرێک بوو هێندەی شاخی قاف بۆ من دووربوو. نە ئەو هێزەم لەخۆمدا دەبینی، نە بۆ بەدست هێنانی هەوڵێکم هەبوو. کاتێک وەک خەیاڵێک چاودێری چەند کچێکی بەرەچەڵەک کوردم کرد، چیرۆکی هەمان ئەو ئەشقە بێ ئومێدانەی بەبیر دەهێنامەوە کە لە مۆسیقاو سترانەکان گوێ بیستی دەبووم. وەک پێشتر ئاماژەم پێکردبوو کاتێک سەبارەت بەهەندێک سیما دەمگوت " پێویستە رەچەڵەکی ئەو کچەش شایستەی ئازادی بێت " لەنزیکەوە گرێدراوی راستی و کێشەی کورد بوو. مۆسیقاکەی ئارام چەند دۆخی "رووداوە بێ ئومێدەکە "ی راستی کوردی پیشاندەدا، ئەو دیمەنەی لە رووخساری کچەکەشدا بینیم دیسان رووداوێکی زۆر بێ ئومێدبوو سەبارەت بەراستی کورد، بەڵام بەسووربوونەوە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە: ئەگەر هەڵوێستێکی سنورداری نامووسیش هەبێت پێویستە بەدوای ئەو بوویەرە بێ ئومێدە، واتە بەدوای راستی کورد بکەویت. بەو دۆخەی کە دایکم تێبینی کردبووم ئاشکرابوو کە بە شێوازی نەریتی ناتوانم لەگەڵ ژن بم. ژنانی مۆدێرنیتەش، تورکەکانیان هێندەی شاخی قاف لێم دوور بوو، کوردەکانیشیان دیمەنی ئەشقێکی بێ هیوایان دەخستە روو. هەڵوێستی کورە کوردو تورکەکانی لام سەبارەت بە ژن ئەخلاقی و ئەستاتیک نەبوو. لەو سۆنگەوە هیچ کاتێک بیرم لەوە نەکردەوە کە لاساییان بکەمەوەو لە کچێک نزیک ببمەوە.**

**وێڕای ئەوەش لەناکاو توشبوونم بە " کەلەرەقی هاوسەرگیری " شایەنی تێگەیشتنە. وەک لەبەشە پەیوەندیدارەکان روونم کردەوە، ئەوە هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژی، ئەتنیکی، سیاسی و دەروونی تێکەڵ بوو. تاقیکردنەوەی لەو تەمەنەدا وەک "مەیدان خوێندن "بوو. لەبواری روحی و نەریتی هەرگیز هاوسەرگیرم نەکرد. ئەگەر بە زەحمەتیشەوە بێت خۆمم رازی کردبوو کە سەبارەت بە شیکارکردنی دیمەنە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکەی دەوروبەری ژن ئەوە ئەزموونێکی زۆر گرنگەو پێویستە لەژیانکردنی نەترسم. بەڵام پێویستە بە بایەخەوە ئاماژەی پێ بکەم کە لەمیانەی ئەو پەیوەندییەوە گەیشتنم بە راستی عەلەوی و ژنی کورد و، بەستنەوەی بە ناسنامەو کێشەی کورد و چارەسەرکردنیەوە وانەیەکی "زۆر زەحمەت " بەڵام فێرکەرو ئەزموون بەخش بوو. ئەو کێشە دەرباز نەکرابوایەو منی تێکشکاندبوایە، ئەستەمە بڵێم هەوڵەکانم دەرهەق بەراستی کورد سەرکەوتوو دەبوون.**